# کورد و جینۆساید و ئیبادەکردن:
# هەڵوێستی یاسای نێودەوڵەتی

(چەند ئاماژەیەکی نموونەیی لە کورتە لێتوێژینەوەیەک)

پارێزەر

هەژار عەزیز سورمێ

چاپی دووەم - ٢٠٠٦

ناوی کتێب: کوردو جینۆساید و ئیبادەکردن هەڵوێستی یاسای نێودەوڵەتی

- نووسینی: پارێزەر هەژاری عەزیز سورمێ

surmehajar@yahoo.de

- نەخشەسازی ناوەوە: کاوە فاروق
- بەرگ: هۆگر سدیق
- هەڵەچن: مەتی مەلیل
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٤٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی دووەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٧٣- ( ١٧٦ )

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

www.mukiryani.com

asokareem@ maktoob.com

Tel: 2260311

پارتی دیموکراتی کوردستان
سەرۆک

الحزب الديمقراطي الكردستاني
الرئيس

بەڕێز پارێزەر کاک هەژاری عەزیز سورمێ

سڵاوێکی گەرم .

کتێبەکەی جەنابت (کورد و جینۆساید و هەڵوێستی یاسای نێودەوڵەتی) کە بە دیاری ناردبووتان بەدەستم گەیشت .

زۆر سوپاستان دەکەم بۆ نووسینی ئەم کتێبە کە بێگومان جێگای شایەنی خۆی لە کتێبخانەی کوردی دا دەگرێت ..

لەگەڵ ڕێزمدا ..

مسعود بارزانی

١٩٩٨/٣/٢

## بسم الله الرحمن الرحيم

## ربنا لا تؤاخذنا ان نسينا أو أخطأنا

**صدق الله العظيم**

**سورەتی (البقرة)-ئایەتی ٢٨٦**

پێشکێشه به:

- رۆحی پڕ چاوەڕوانی دایکی شەهیدم.

- گیانی بەرزەفڕی شەهیدانی نەتەوەی کورد.

- پارێزەر و داکۆکیکارانی (مافی مرۆڤ) لە هەر کوێیەک هەن.

- ئەوانەی لە پێناوی (ئا!!!)یەکانیان، نرخ و قوربانیان داوە.

- ئەو کەسانەی بە راستەقانیی، ئاشتی و ئاسایش و تەبایی گەلانی دونیایان گەرەکە.

بە پاکی.. راستگۆیی.. خۆنەویستی

- یادی کۆچڕەوە چەند ملیۆنییەکەی بەهاری 1991،هەریەک

لەوانەی بەلەشی رووت و سکی برسی دەیگوت:

نیشتیمانی خۆمە، دەیبینوم،مەڵێن ئاوارەیە

## پێشەکی

ئەگەرەکانی نووسین لەسەر ئیبادە و قڕکردنی میللەتێکی ڕەسەن و خودان دیرۆکی هەزاران ساڵە، لەلایەن هەر کەسێکی مافپەروەر و هەقخوازەوە؛ ئەمازە ئەندامێکی ئەو گەلە، ل نک هەموواندا ڕۆشنە و پێدڤیی ڕوونکردنەوە ناکات..

بەلام ڕەنگبێ هەبن لە چلۆنایەتی و هۆیەکانی (ورووژانم) بۆ ئەو بابەتە بپرسن؟. چی بوون ئەوانەی هەست و هۆش و ناخیان هەژاندم و پەلکێشی تۆمارکردنی چەند وێنەیەکی واقیع و حەقیقەتیی پڕ ڕاستەقانی سڕینەوەی میللەتەکەمیان کردم ؟؟..

وەک بۆیان گێڕاومەتەوە و تێیدا ژیاوم، لە 1962 جارێک و لە 1967 دا چەلێکی دیکە، خانوو و ماڵ

و حاڵمان بەدەستی جاشەکان و پیاوانی رژێمی ئەوسا سوتێنراوە و تالان و بڕۆکراوە و هەر بەدەستی ئەوان لە ساڵی دووەمدا 'هەندرێن'ی برام بە نێزە سکی هەڵدرا و شەهید بوو.. ئەوەش بەو (تۆمەت)ەی کە باوکم لە سەنگەری شۆڕشی 'مقاومەتی ئیبادەکردنی کورد' دا (شۆڕشی ئەیلول (پێشمەرگە)یەکی چالاک بووە.

لە 1966وە بۆ نزیکی 1970 بە هەمان (تۆمەت) جاش و کاسە لێسەکان هەڵیان دەکوتایە سەرمان و ئازار و موعانات و شەڕی دەروونی بێ ئامانیان دەگەڵدا دەکردین و دەیانویست وەک 'بارمتە' و 'بەدیل' بمانگرن یا بمانکوژن. لەبەر ئەوە ماڵ بە ماڵ و کۆڵان بە کۆڵان و گەڕەک بەگەڕەک خۆمان لێ دەشاردنەوە.

لە 11ی ئاداری 1970مەلا مستەفای بارزانی رێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا مۆرکرد، کەچی لە 1971 دا و لەلایەن ڕژێمی لایەنی یەکەم لە ڕێککەوتننامەکە، گلاوترین نەخشەی (شەهیدکردنی بارزانیی نەمر پیادەکرا، بەسیفەتی ئەوەی کە (نوێنەر و ڕابەر و ڕەمزی مێژووکردی کوردە) نەک بەسیفەتی شەخسیی خۆی کەدیارە ئەوەش بە تاوانێکی دژ بە مرۆڤایەتی دەژمێردرێت

لە ساڵی 1974 دا ڕژێمی بەعس رازی نەبوو لایەنی کەمی مافەرەواکانی گەلی کورد بدا و شەڕێکی بێ ئامانی

گرد! ئەو وەخت دە ساڵم لە تەمەندا نەبواردبوو، چاکم لە بیرە کە بە سکێک تێر و دە سک برسی، ئەو خەڵکە لەترسی باڵەفرە جەنگییەکانی مێک و سۆخۆی ڕژێم، لەو بەهارە تەڕ و سازگارەدا، لەو خاکە پڕ لە زەمەند و زەنوێرە، وەک ئاردی نێودڕکی پەڕیوە و پەڕاگەندەی بن تاوێر و تاشەبەرد و ئەشکەوتان بووبوون، ئەو کونە ئەشکەفتەی خانەوادەکەمانی لێبوو، کە 5, 2 × 5, 3 ×5, 1 درێژی و پانی و بەرزی دەبوو، چەندین کەس و خێزان لە ژن و منداڵ خۆیان تێئاخنی بوو و لە بێجێ و ڕێییدا ئەوەی بیوێرایە بخەوێت، دەبوایە بە دانیشتنەوە یاخود نۆبەتی بۆ وەرگرێت .

ئەرزی ئەشکەوتەکە تەڕ و شێدار و (دارو دیواریشی) کونی جڕوجانەوەری وەک مار و دووپشکی تێدابوون....

لەو وەختەیدا، رژێم لە بەکارهێنانی هەرچی جۆرە چەکێکی کە هەیبوو درێخی نەکرد، گوتەی ئەوە لە نێو منداڵە قوتابییەکاندا بڵاوبوو کە (هیندو فەرەنساو رووسیا) تۆپ و تەیارە و ناپاڵم و مین لە شێوەی (یاری) منداڵان بەبەعس دەدەن بۆ ئەوەی ئێمەی پێ بکوژن.

لە ژێر فشاری هێرشە ڕادەبەدەرەکانی فڕۆکەکاندا لەڕووی چەندایەتی و چلۆنایەتییەوە !لە خوێندن دابڕاین و لە هەر چرکەیەکدا چاوەڕێی مەرگی خۆمان بووین؛ بە چاوی خۆمان مەرگی چەندین ئازیزانمان بینی.....

ئـەو ئیبادەیەی لە سـەر پـردی گەلالە کرا بەو شـێوە هەمەجییانەیە، ناکرێ لە بیر بچێتەوە.......

لەگەرمەی شـەڕی ئیبادە و مقاومەت کردندا، بە هەوڵ و هیممەتی شـۆڕش، ڕەزامەندی ئێران لەسەر داڵدەدانی خێزان و ژن و منداڵ وەرگیرا، بەو ڕەنگە بێ ئەوەی هیچ مافێکی ئەوتۆی پەنابەریمان هەبووبێت، پەنامان بە ئەوێ دا، ژیانی غەریبی و مەمرەمەژیی خێوەتگاکان و خوێندنی نێو کەپرەی حەسیر، وای لە هەندێ مامۆستا کرد، دڵمان بدەنـەوە و ڕەوش و بارو زروفی فەلەسـتینیەکانمان تێ بگەیەنـن، کە ئەوانیش ئـاوا پەڕاگەندە بوون و زۆربەیان کلیلـی دەرگاکانـی ماڵەوەیان لای خۆیان پاراسـتووە و هیوایـان بـە هێزە کە ئـەو ڕۆژە بێت ئـەوان بەو کلیلانە دەرگاکانیان بکەنەوە!..

ئێمەش ئـەو کلیلانەمان لابوو، بەڵام هەر لە مشـەختی و ئاوارەیـی ئـەو دیودا بوویـن، کە هەواڵی سـووتان و خاپوورکردنـی خانـوو و مـاڵ و کتێبخانەکەمـان )کە لە گەلالـە بوو)، پێگەیشـت، ئەویـش لە لایـەن ڕق و ناپاڵم هاوێژەکانی بەعس. ئیـدی لەمەودوا هیچ دەرگایەک نەما بەو کلیلانە بکرێنەوە.

لەو بەر ئەنجامەدا کەم تا کورت لە (نێوەڕۆکی) سیاسەتی شۆڤێنیسـتانەی بەعس گەیشتم و لەو مەنزوورەدا پەیپێی بیرکردنـەوەی منداڵانـەی خۆم بە (شـیعر) گوزارشـتم

لێدەکـرد و دەمزانــی زوڵم و زۆر دەســتی یەکـە، ئەمما نەمدەزانی حاڵەتەکە چی پێدەڵێن، دەورووپشــت ئەو گرێ کوێرەشــیان بۆ کردمەوە بەوەی: کـە (بەعس دەیهەوێت کورد (ئیبادە) بکاو نەیهێڵێ، بۆیە ئێمە لێرەین!!...)

لە تەنکاودا ئیبادەم ناسـی، بێ ئەوەی لە قووڵاییەوە لە مەغـزا و ماهییەتـی بگەم، هەتا کات و سـاتی تەرحیل و راگواستنمان (پاشماوەی ناوچەی باڵەکایەتی) لە سەرەتای هەشـتاکان و مـاوەی قوتابییتیـم لە کۆلیژی یاسـادا کە ئیبادەی لە ژێر ناوی جینۆسـاید و وەک (تاوانێک، بەپێی یاسـای نێودەوڵەتی) پێناسـاندم و ئەشـکەنجەی نەفسی و جەسـتەیی کە لەگەڵ زۆربـەی قوتابیانی کورد دەکرا، هەروەها هێرشـەکانی ئەنفـال و ژەهر باران و ئیعداماتی بە کۆمەڵ، وایان لێکردم کە پتر لەو بابەتە بکۆڵمەوە و بە دوای دابچم، بۆ ئەم مەبەسـتە و لە روانگەی هەستکردن بە مەسئولیەت و ئیلتزامی ئەخلاقی و مێژوویی، چەندین وتارو کورتە باس و لێکۆڵینەوەم لە سەر مافی مرۆڤ و (مرۆڤی کورد) نووسی، لەوانە (کورد و جینۆساید و یاسای نێودەوڵەتی) بەڵام لەسەرەتای 1995 دا لە پاش تالان و برۆکردنی کتێبخانە ماڵ و حاڵەکانمان لە شەڕی نەگریسی ناوخۆدا، نووسینەکانم ئەوانەی بڵاونەکرابوونەوە، لە گەڵ ئـەو تالان و برۆیە کەوتن و لێرەدا جارێکی تر کەڵکەڵەی نووسـینەوەی ئەم باسـەم کەوتەوە سەر و جارێکی دی

کۆششـــم کرد و هەندێ سەرچاوەم لێرە و لەوێ دەست خست و تێهەڵچوومەوە.......

لێکۆڵینـــەوە لـــە تاوانەکانـــی ســـەرۆکی ڕژێـــم و دار و دەستەکەی، کاری چەندین لیژنەی پسپۆڕ و تایبەتمەند و دەیان و ســەدان بەرگی گەرەکە بۆ تۆمارکردنیان، لێرەدا من تەنیــا بە ئاقاری ئیبــادە و جینۆســایدکردنی کورددا ڕەت بـــووم و لەمیانەی چەند ئاماژەیەکدا بڕێک نموونەم تۆمارکردووە .

بۆ ئەو مەبەســتە پلانی کورتە باسەکەم بۆ سەر شەش پار و بەو شێوەیەی خوارەوە داڕشت:

پـــاری یەکەم: جینۆســـاید، وەک واتا، دیـــاردە، مێژوو و تاوانی نێودەوڵەتی .

پاری دووەم: جینۆســاید، بە مەفهومـــە فراوانەکەی، یان ڕێگاکانی ئیبادەکردن .

پـــاری ســـێیەم: نەخشـــە و شـــێواز و ئەنجامدەرانـــی جینۆساید.

پـــاری چـــوارەم: ســـزادانی ڕژێـــم و دادگایـــی کردنی... چۆن؟!.

پاری پێنجەم: جینۆســـاید و بنەمای تەســـلیم کردنەوەی تاوانباران .

پاری شەشەم: جینۆساید کۆنیش بێت بەسەر ناچێت.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی لای سەرەوە و وەک بەڵگەیەکی

بەردەست بۆ خوێندەڤانی بەڕێز، پاشبەندێکیشمان ئامادەکردووە کە لە چەند ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی و چەند بڕیارێکی ناڕەوای سەرانی ڕژێم و لیستێکی نموونەیی گوندە کیمیایی لێدراوەکان و چەند وێنەیەک و لیستێکی دیکە بە ئامرازەکانی کوشتن و ئازارو ئەشکەنجەدان، کە لە لایەن ڕژێمەوە کراون؛ پێکهاتووە. ئومێدەوارم ئەو کورتە باسەم ئەمەکدارییەک بێت بۆ قوربانییان و شەهیدە سەربڵندەکانی وڵاتەکەم و بەشدارییەکی بچووکم لە (داکۆکی کردن لە مافی مرۆڤ) دا کردبێت.

هاوینەهەواری پیرمام
1996

# جینۆساید؛
# وەک واتا، دیاردە، مێژوو، تاوانی نێودەوڵەتی

بـەر لـەوەی بچینە قووڵایی مەبەسـت، لـەم تەنکاوەی پاری یەکەمدا بە پێویسـتی دەزانین وشـەی جینۆسـاید روون و رۆشـن بکەینەوە و شـوێنی لە نێـو تاوانەکانی دیکـەی نزیک لە مەغـزا و ماهییەتی خۆیدا دیاریبکەین و جوێی بکەینەوە، قامک نیشـانی ئەوە بکەین کە ئەم تاوانە بە درێژایـی دیرۆکی هەزاران سـاڵەی مرۆڤایەتی، وەک دیاردەیەک، لەلایەن دیکتاتۆر و شەڕانگێز و تاوانکارانەوە، بە وەحشیانەترین شێواز ئەنجامدراوە و دیرۆکی کوردیش تێیدا بەشـی شـێری بەر کەوتـووە، لە پاشـدا پێدڤی کو ئـەوە دیاریبکەین کە ئەو تاوانە مەزنە، ئەگەر تا شـەڕی دووەمی جیهانیش هەروایی وەک دیاردەیەک بوو بێت، ئەوا

دوای ئەم شـــەڕە، بە هــۆی ڕێککەوتنێکی نێودەوڵەتییەوە کە زێتر لە ســـەد دەوڵەت واژوویان کردووە و چوونەتە ڕیزییەوە، وەک تاوانێکی نێودەوڵەتی ناسراوە و جەوهەر و ماهییەتی دەستنیشان کراوە و ئەو کۆڵەگە (ركن) انەی کــە ئەنجامدانی ئەم تاوانە دەســـەلمێنن دیــاری کراوە و بەو پێیەیەش ئەنجامدانــی قەدەغەکراوە و ئەنجامدەرانی سزایان بۆ دانراوە ؛ لە بەر ئەوە پاری یەکەممان بۆ سەر چوار پشکان دابەشکرد:

## پشکی یەکەم
## وشەی جینۆساید چۆن و لە چییەوە هاتووە؟

ناوزەدکردنــی ئیبــادە و قەتڵ و عام بە (جینۆســاید) و وەکارخســتنی لە یاسای نێودەوڵەتی ســزاییدا، بۆ یەکەم جار لە دوای شەڕی دووەمی جیهان هاتەکایەوە، کە تێیدا خەتەرناکتریــن مــاف، کــە مافی بوون و ژیانــە و بەندی ســێیەم لەجاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ (1948) پێی لە ســەر داگرتــووە، دەرهق بە هەندێ گــرووپ و میللەت و کۆمەڵ، ئینکاری و نکوڵی لێکرا.
زاراوەی جینۆساید (GENOCIDE) لە دووبڕگە پێک هاتووە، یەکەمیان ((GENOSی یۆنانی بە مانای (ڕەگەز) و ئــەوی تریان (CIDE)ی یۆنانــی یا (CAEDERE)ی لاتینی واتای کوشــتن دەگەیێنێ و بەســەر یەکەوە مانای کوشــتنی رەگەزی مرۆڤ دەبەخشــێت و لــە مەفهوومدا مەبەست کوشــتنی بەکۆمەڵ یا قڕکردن یان کۆکوژییە .. هتد[1].

یەکەمین کەس کە ئەم زاراوەیەی چەسـپاند و جێگیری کرد (RAFAL LEMKEIN) بوو کە بە ئەسڵ پۆڵۆنی و بەرەگەزنامە ئەمریکایی بوو و لە دوای شەڕی جیهانگیری دووهەمـەوە پلـەی ڕاوێژکاری وەزارەتـی جەنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای پێ بەخشرابوو .

ڕەنگە ئەوەی زیاتر وای لێکردبێت کە بیر لەو زاراوەیە بکاتەوە و بە شای تاوانەکان یا تاوانی تاوانەکانی بزانێت (بە دەر لەوەی کە بۆخۆی شارەزایەکی ئەم بوارە بووە)، ئەوەیـە کـە خانەوادەکەی دوای ئەوەی کـە کەوتوونەتە دەستی نازییەکانەوە، خڕ قەتڵ و عام کراون[2].

٢

## پشکی دووهەم:
## شوێنی جینۆساید لە نێو تاوانەکانی دیکە و جوێکردنەوەی:

وەک ئاشـــکرایە، هەموو ئەو تـــاوان و گەورە کەتنانەی کە سیفەتی جیهانی و نێودەوڵەتییان هەیە بە دەستدرێژی و دوژمنـــکاری دەژمێررێـــن بۆ ســـەر بەرژەوەندییەکانی تەواوی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، وەک پاراســـتنی ئاشـــتی و ئاســـایش و بەر گرتن لە شـــەڕ و تیرۆر و کوشتنی بە کۆمـــەڵ و بەرگرتن و نەهێشـــتنی جیاخوازیی ڕگەزایەتی و پاراســـتنی عورف و یاســـای شـــەڕ لە نێو دەوڵەتان و جیهاندا.

لێک جودایی و هەمەچەشـــنی ئـــەو بەرژەوەندییانە، کە یاســـای نێودەوڵەتی ســـزایی دەیانپارێزێ، وایکردووە کە تاوانەکانیـــش هەمەجۆربن؛ بەو ڕەنگـــە ئەگەرچی هەموو

تاوانەکان دەرژێنەوە نێو یەک رووبار و لە یەک سەرچاوە هەڵقـوڵاون، دەشـوبهێنە ئێـک، بـەڵام بەپێـی جیاوازی بەرژەوەندییەکان، شێوازو شوێن و کاتیان جیایە و لێرەدا بەگشتی پۆلێنی سەر چوار بەش کراون:

**یەکەم :**

**تاوانەکانی دژ بە ئاشتی :**

مەبەسـت لەمە ئەو هێرش و دوژمنکارییە چەکدارانەیە کـە بەپلانێکی داڕێژراوی بەروەختـەوە لەلایەن دەوڵەتی دەسـتدرێژکارەوە دەکرێتـە سـەر دەوڵەتی دەسـت بۆ درێژکراو، بەسێ هەنگاو (پروپاگەندەی ڕاگەیاندن، پیلان گێران، بەرپاکردن و راگەیاندنی شـەڕی دوژمنکاری)؛ بۆ ئەم مەبەسـتەش بەندی (2) لە پـرۆژەی ڕێککەوتننامەی تاوانەکانـی دژ بە ئاشـتی و سـەلامەتی مـرۆڤ (28ی تەمموزی 1954) وەسـفی تاوانەکانی دژ بە ئاشتی دەکا بەوەی کە: پروپاگەندەی راگەیاندن وەک ڕێخۆشـکارێکی شەڕو گەف و هەڕەشە و خۆئامادەکردنە بۆ بەکارهێنانی هێـز لە دوژمنکاریەکدا؛ و ڕێکخسـتنی کۆمەڵ و گرووپی چەکدار بە مەبەستی هێرش بردنە سەر ئیقلیمی دەوڵەتێکی تـر، خۆ تێهەڵسـوین لـە کاروبـاری دەرەوە و ناوەوەی دەوڵەتێکـی دیکە و پیلان گێڕانی ڕێکخراو و بەرپاکردنی شـەڕی دوژمنکاری و دەسـتدرێژیانە، بـە تاوانی دژ بە

ئاشتی دەژمێررێن[3].

بە پێی ئەم مەفهوومە، رژێمی عێراق دوو شەڕی دەست درێـژکاری و دژمنکارانــەی بەرپاکــردووە، یەکەمیــان لــە دژی رژێمی ئێــران (1980 - 1988)کــە ئەمینداری پێشــووی نەتەوە یەکگرتوەکان (خافێر پیریز دی کویلار) ئــەوەی ســەلماند و عێراقی بە دەســتپێکەری شــەڕ دانا؛ دووهەم شەڕی دوژمنکاری ئەوەی کوێت بوو، کە لەگەڵ دەســتدرێژی و هێرشــی چەکدارانەدا لە (1990/8/2) دا داگیریشــی کرد (بڕیارەکانــی ئەنجومەنی ئاســایش لەم بارەیەوە، یەک لە بەڵگە و گەواهییەکانن).

**دووەم :**

**تاوانەکانی دژ بە ئاسایشی بەشەریەت :**

مەنزوور لەو تاوانانــە، هەموو ئەو گەورە کەتنانەن کە دڵەڕاوکێ و ترس و لەرز دەخەنە دڵی خەڵک و کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە، بێ ئەوەی بگاتە حاڵەتی شەڕ لەنێوان دوو دەوڵەتــدا؛ وێنەی ئەم جــۆرە تاوانانە کە زیاتر لە حاڵەتی ئاشــتیدا بەرشــەقی بەر پاکردنیان هەیە (ڕفاندنی فڕۆکە) و تیــرۆر و تۆقاندنی نێودەوڵەتییە) و ئەوەی بەرایی دوو ڕێککەوتننامــەی نێودەوڵەتی بۆ تەجریمکردنی دەرچووە، یەکەمیان لە تۆکیۆ لە 14/ 9 / 963 و دواییشیان لەلاهای لە 16 / 12 / 1970[4].

بــه گویــرەی تیــرۆری نێودەوڵەتیشــەوە کــە خۆی لە تەقاندنــەوە و تێکدانی دامەزراوە گشــتییەکان و تێکدانی هێڵی شــەمەندەفەر و کوشتن و ڕفاندن و بڵاوکردنەوەی نەخۆشــی بەربڵاو ....... هتد، دەبینێتــەوە؛ لە زۆر بڕیارو ڕێککەوتننامەدا باسی سنووردانان و نەهێشتن و بەرلێگرتنی کــراوە، لەوانە پــڕۆژەی ڕێککەوتننامــەی تاوانەکانی دژ بــە ئاشــتی و ئاسایشــی بەشــەریەت (1954) لە بەندی دووەمیدا؛ و بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان (1970/12/11) تایبــەت بــووە بــە نەهێشــتنی تیــرۆر، هەمدیس لەم بارەیەوە دوو ڕێککەوتننامەی تر دەرچوون؛ یەکەمیــان ڕێککەوتننامــەی جنێــڤ (937/11/16) بۆ لە نێوبردن و ســزادانی تیرۆر و ڕێککەوتننامەی پەیوەست بە دامەزراندنی دادگایەکی سزایی نێودەوڵەتی، کە زامنی دادگایی کردنی ئەنجامدەرانی تیرۆر بکات، هەرچەندە ئەم دوو ڕێککەوتننامەیە تا ئەمرۆش جێبەجێ نەکراون لەبەر (بڕوایی نەدان) پێیان، بەڵام بەپاڵپشتی عورفي نێودەوڵەتی و بە هەڵهێنجان لە بڕوانامە و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشــتی پابەست، ئەوە بڕاوەتەوە کە تیرۆری نێودەڵەتی، گەورە تاوانێکی نێودەوڵەتییە[5].

**سێهەم :**

**تاوانەکانی جەنگ**

ئەو تاوان و لادان و سەرپێچیانە دەگرێتەوە کە لەکاتی شەڕدا، دەرهەق بەو یاسا و خوونەریت و پەیماننامانە ڕوودەدەن کە بارەکانی شەڕ ڕێک دەخەن و سنوور و چوارچێوەی بۆ دادەمەزرێنن؛ بە مانای ئەو تاوانانەی کە لە جەنگدا دەکرێن و دژ بە عورف و یاسای شەڕن وەک: سەودا و هەڵسوکەوتی نامرۆڤانە دەگەڵ نەخۆش و بریندار و ئێخسیرەکانی شەڕ و تێکدانی دامەزراوە گشتییەکان و ڕفاندنی ئافرەتان و ناچارکردنیان بۆ ئیشی خراپ و ئابڕووبەر، مامەڵەکردنی خراپ دەگەڵ خەڵکی باژێرڤانی لە ئێقلیمێکی داگیرکراودا، ژەهراویکردنی ئاو، بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراو و کوشتنی بە کۆمەڵ و تێکدانی گوند و باژێڕان و دزی و ڕاو و ڕووت لە موڵک و ماڵی دەوڵەت بەتایبەتی، سەپاندنی باج و رسومی ناڕەوا و هەر گەورە کەتنێکی تر کە تخوونی یاسای شەڕو زەرورەتی سەربازیی پێویست، ببەزێنێ[6].

نموونەی ئەم بڕوانامە و ڕێککەوتننامانەی کە زامنی بەرگرتن و نەهێشتنی ئەنجامدانی ئەم تاوانانەی لای سەرەوەن، لەکاتێکدا ئەگەر دەوڵەتان لە وەختی شەڕدا ئیلتیزامی پێوە بکەن: ڕێککەوتننامەی جنێڤ ساڵی 1864 و پەیماننامەی لاهای ساڵانی 1899 و 1907 هەروەها

ئەو لیستەی کە لە هەردوو: گەلاڵەنامەی نورمبێرگ و توکیو (بەندی 6/ب، بەندی5) دا هاتووە و بەندی (12/2) لە پرۆژەی ڕێککەوتننامەی تاوانەکانی دژ بە ئاشتی و ئاسایشی بەشەریەت و هەندێک لە بەندەکانی ڕێککەوتننامەکانی جنێف (1949) (بەندی (50) لە ڕێککەوتننامەی یەکەم وبەندی (51) لە ڕێککەوتننامەی دووهەم وبەندی (130) لەوەی سێیەم و بەندی (147) لە دوایەمین ڕێککەوتننامە) ... هتد[7] . ڕژێمی عێراق لە شەڕەکانی ناوخۆ و ئێران (نەمازە لەکاتی گرتنی شارەکانی ئەوەی دوایی (هەروەها شەڕی کوێت) ممارەسە کردنی تاوانەکانی جەنگی کردووە.

چوارەم :

### تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی

ئەمەش جینۆساید و جیاخوازیی ڕەگەزایەتی (ئەپارتهاید) وتاوانی دژ بە مرۆڤایەتی (بە شێوەیەکی گشتی) دەگرێتەوە، بەم شێوەیە:

(1) جینۆساید: بەپێی بەندی دووەم لە ڕێککەوتننامەی لە نێوبردنی جینۆساید (1948/12/9) و سزادان لەسەر ئەنجامدانی هەر کارێکی بە مەبەستی لە نێوبردنی گشتی یا بەشێکی کۆمەڵ و گرووپێکی ئادەمیی لە سۆنگەی نیشتیمانی یا ئاینی یان تایەفەگەری و ڕەگەزایەتی، بکرێت

بە جینۆساید دەژمێررێت، ئەمەش وەک کوشتنی ئەندامانی کۆمەڵێک و هێرش و دەستدرێژیی جەستەیی و سایکۆلۆژی بۆ سەریان، هەروەها خستنەژێر باری گوزەرانێکی ئەوتۆی کۆمەڵێک، کە ببێتە هۆی قڕبوون و ئاسەوار بڕانەوەی خڕ یـا پشـکێکیان، گواسـتنەوەی منداڵان بــە زۆر و زەبر، لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە .... هتد.

لەبـەر کاریگەریـی و خەتەرناکیـی جینۆسـاید، ئـەو ناوەڕۆکەی لای سـەرەوە (بەندی شەشەم/ج) لە پێڕەوی دادگای سەربازیی نێودەوڵەتی جەختی لەسەر کردۆتەوە، هەروەها یاسـای ژمـارە (10) سـەبارەت بە سـزادانی ئەنجامدەرانی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە ئاشتی و سـەلامەتی مرۆڤایەتی کە لە بەرلین لە 1945/12/20 دا واژووکراوەو، لە بەندی (2/ج) ئاماژەی بۆ کراوە جگە لە ڕێککەوتننامەی بەسەرنەچوونی تاوانەکانی شەڕ و دژ بـە مرۆڤایەتـی (3/ 12 / 1968) لـە بەنـدی (1/ ب) وا دەردەبـڕێ کە ئەم تاوانە هەچ کاتێـک ئەنجامدرابێت، بۆ مەسـەلەی دادگایی کردن و لێپرسـینەوە بە سـەرناچێت و کـۆن نابێت، هەروەها پرۆژەی یاسـای تاوانەکانی دژ بەئاشـتی و سـەلامەتی بەشـەرییەت (1954) لە بەندی (10/2)یدا هەمان دەقی بەنـدی دووەمی ڕێککەوتننامەی جینۆساید (1948)ی دووبارە کردۆتەوە[8].

(2)جیاخوازی ڕەگەزایەتـی: وێنەیەکی تری تاوانەکانی

دژ بــه مرۆڤایەتییــە و لێــرەدا هــەر جیاوازییــەک یــا دوورخستنەوەیەک یاخود خۆ لەپێشترگرتن و خۆبالاترێک هەبێت لەســەر بناغەی ڕەگــەز و ڕەنگ و بنەچە و ئایین و ڕەگەزنامەوە بێت بە شــێوەیەک کە ڕێگە لە پیادەکردن و دانـنان بە مافە سیاسی و سۆسیۆلۆژی و کەلتووری و ئابوورییەکانــی مرۆڤ بگرێت یا ســنووری بۆ دابنێت، بە جیاخوازیی ڕەگەزایەتی حسێبە[9] .

(3) تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی بە شــێوەیەکی گشتی: نموونەی ئەمە لــە بەندی (6/ج) لە بنەما هەڵێنجراوەکانی دادگاییەکانــی نۆرمبێرگدا هاتووە وەک کوشــتنی خەڵکی باژێرڤانیی و لەنێوبردنیان،(هەر کارێکی نامرۆڤانە) و (هەر چەوساندنەوەیەک) کە بەسەبەبی سیاسی و تایفەگەری و ئاینییەوە بێت بــە مەرجێک ئەگەر تاوانکردنەکە بەرامبەر یــەک کەس بێت. ئــەوا دەبێت بــە ســیفەتی ئینتمای ئەو کەســەوە بێــت بۆ گرووپێکی بەشــەریی ئــۆل تایبەتی و جیاواز[10].

لێرەدا، دوای ناساندنی هەرچوار جۆرە تاوانەکان، لێمان ڕۆشــن بوەوە کــە جینۆســاید، وێنەیەکی بەرجەســتەی تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتییە و ئەگەرچی لە زۆر ڕووەوە دەگەڵ تاوانەکانی تریش تێک دەکاتەوە،بەلام خاسییەت و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە و بە هۆیەوە دەکرێت لە تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتیش جوێ بکرێتەوە، ئارمانجی جینۆســاید

نەهێشــتن و لە نێوبردنی هەموو یان بەشــێکی کۆمەڵ و گرووپێکە لە رووی لەشــی و سایکۆلۆژی و بایلۆژییەوە، بەڵام تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی (بەشــێوەیەکی گشتی) بریتییە لە چەوساندنەوەی خەڵکانێک بە ئەگەری سیاسی و ئایینی و تایەفەگەری.

جینۆســـاید وەک قامکمـــان بۆی ڕاکێشـــا، ڕووبەڕووی کۆمــەڵ و گرووپێــک دەکرێتــەوە، بــەڵام تاوانەکانی دژ بەمرۆڤایەتی لەوانەیە یەک کەس بگرێتەوە بە نوێنەرایەتی گرووپێکی بەشەری.

جینۆســاید چ لەکاتــی شــەڕ و چ لــە کاتــی ئاشــتیدا ئەنجامبدرێــت جێــگای ســزادانە، وەلــێ ئەوانــەی دژ بە مرۆڤایەتــی، تەنهــا لە ڕۆژانی شــەڕدا ســزای لەســەرە چونکە پەیوەســتە بە ئەنجامدانی تاوانەکانی شــەڕ و دژ بە ئاشتی.

لــە نموونەیەکــی تردا کە خاســیەتی جینۆســاید چاکتر وەدەردەخات جیاوازیەتی لە (پیلانگێڕان دژ بە ئاشتی) کە وێنەیەکی تاوانی دژ بە ئاشــتییە، بەوەی کە بۆ مەبەستی ســزادان مەرجە تاوانکاران لە توێژی دەســـەڵاتداران بن، واتە ئەوانەی نەخشــەی سیاسەتی وڵات دەکێشن، کەچی لە جینۆســـایددا ســزا بەسەر دەســـەڵاتداران و کارمەندە گشــتییەکانی دەوڵەت و تاقە کەســان، دەسەپێنرێت وەک ئەنجامدەرانی ئەم گەورەکەتنە[11].

## پشکی سێیەم :
## نموونەی جینۆساید لە مێژوو و مێژووی کورددا

جینۆساید، بەر لەوەی بکەوێتە فەرهەنگی یاسای نێودەوڵەتییەوە و تەجریم بکرێت و سزا و دیسپلینی دیکەی بەرلێگرتنی بۆ دابنرێت؛ بەر لەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لێی بپرسێتەوە و ئەنجامدەرانی مەحکووم بکات، وەک دیاردەیەکی زەق، دەمێکە دەگەڵ گرووپ و میللەتاندا ئاشنایە و مێژووی سەرهەڵدانی بۆ چەندین سەدە بەر لەدایکبوونی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) دەگەڕێتەوە، لێرەدا بەو ڕەنگەی خوارەوە چەند نموونەیەک دەخەینە بەر چاو:

**یەکەم:**

**دیاردەی جینۆساید لە مێژوودا :**

لە ساڵی 612پ.ز دا بابلییەکان، قەسابخانەیەکی

کۆمەڵکوژییان بۆ ئاشوورییەکان نایەوە و وەحشیگەرانە زۆربەیان قڕکرد و ڕەشــکردەوە و (نەینــەوا) یان تەواو خاپــوور و ویرانکــرد، تەنانــەت کاتێــک (گەزەنفــون)ی سەرکردەی سەربازی یۆنانی (نزیکەی 427-335 پ.ز) لە دوای دووسەد ساڵ بە خۆی و دەهەزار سەربازییەوە بە پێش پاشــماوە و شوێنەواری نەینەوادا تێپەڕبوو، بۆی ساغ نەبۆتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شارێکی ئاوەدان بوو بێت[12].

هــەروەک لــە 596پ.ز دا، نەبوخوزنەســری پادشــای کلدانــی (نزیکــەی 605 - 562 پ.ز) شــاری یەهــودای ئیســرائیلی تارومارکرد و دوو شۆڕشــی ئەوانی لە سەر خاکــی یەهــودا، بە ئاگرو ئاســن، خامۆش کــردەوە و لە 539 پ، ز دا پادشــای فارســەکان (کۆرشــی یەکەم) بە ویرانکردنی بابل، یەهودەکانی ئازاد کرد[13].

لــە 10/ 2/ 1258 ی عیســاییدا، مەغــۆل و تەتــەر، بــە ســەرکردایەتی هۆلاکــۆ، روویان لە بەغــدا کرد و لە مــاوەی(40) دانــە ڕۆژدا، قەتــڵ و عام و کوشــتارێکیان نایەوە، ژن و منداڵ و پەککەوتە و دیلیشی گرتەوە، لەلای ئــەوان ئەوەی شــەڕی دەکرد و ئەوەی تەســلیم دەبوو، فەرقێکی نەبوو و ســەری دەبڕدرا، بــەو ڕەنگە لەو ماوە کەمەدا (80) هەزار کەس تەنها لە دانیشــتووانی شــاری بەغدا ئیبادەکران[14].

لــه 1492ی عیســایی، دوای ئــەوەی کــه کیشــوەری ئەمریــکا دۆزرایــەوە، خودانی شــەرعی ئەم کیشــوەرە هیندییه ســـوورەکان بوون، کــه ژمارەیان چەندین ملیۆن کەس دەبــوو و دوای کۆچکردنی گەلانی ئەوروپا بەرەو ئەوێ، ئەوان بوون به بێگانه و ئێستا دوای چەندین سەدە کەپێویســته ســالانه زیاد بکەن کەچی ژمارەیان له چەند سەد هەزارێک تێناپەڕێت، عەجەب وایه، ئەگەر به شێوازی جیاواز، ئیبادە نەکرابن؟!!![15].

لــه وێنەی جینۆســایدێکی له ســەرەخۆدا، له ســەدەی نۆزدەیــەم، بەریتانیــا ئەفیوونی له چینــدا بلاو کردەوە و ئەوە کاریگەرییەکی تژی ســلبیانەی کردە سەر کۆمەڵگای چینی، نەخاسمه لاوەکان کەنەک هەرنەیان توانی داکۆکی له ولاتەکەیان بکەن، بەڵکو له چاوی ئەو ئەفیوونەدا بوونه بارگرانابیش، ئەوەش خواست و ئاواتی ئینگلیزەکان بوو، کاتێکیش چین له (1839) دا، هێنانی ئەفیوونی قەدەغەکرد و لــه بەرژەوەنــدی بەریتانیای داو کۆگاکانــی ئەفیوونی ئەوانی لــه ولاتدا بنبڕکرد، بەریتانیا لــەو بارەیەوە دوای ســێ تاقــه ســاڵ لــه 1842 دا پەیماننامــەی (نانکین) ی بەسەر چیندا سەپاند، که به هۆیەوە زۆربەی کەنارەکانی چین له بەردەم بازرگانی بەریتانیادا کراوەبێت، ئەوە بوو له پاشــدا تەنازولی (هۆنگ کۆنگ) یشی بۆ بەریتانیا کرد، ئەمه له مێژوودا به (شەڕی ئەفیوون) ناوزەد کراوە[16].

یەکەم ڕۆژانی ئابی 1914 کە شــەڕی یەکەمی جیهانی تێــدا بەرپا کرا، کۆمەڵێـک کاری جینۆســاید دەرهەق بە چەندیــن گرووپی جیاجیا ئەنجامــدران و ملیۆنەها کەس تیاچوون.

لە 22/ 4/ 1915 دا لە کاتی شەڕی یەکەم، ئەڵمانەکان گازی ژەهــراوی (کلۆر)یــان لــە دژی فەرەنســاییەکان بەکارهێنــا و لــە دوای ئەوانیشــەوە ئینگلیــزەکان لــە 1915/4/24 یەکەم هێرشی گازییان کرد، لە 1915/9/25 سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی و ڕێکخراوی تورکیای لاو بــۆ وەدەرنان و لە بەین بردنــی ئەرمەنەکانی تورکیا (بــۆ بەرگرتن لە جیابوونــەوەی ئەرمینیای ڕۆژهەڵات لە تورکیــا)، خەتەرناکترین قەســابخانەی کــەم وێنەیان بۆ دروســتکردن و ڕووبــاری خوێناویــان نایــەوە، نزیکەی (300) هەزار قوربانی بە دەســتی سوڵتان عەبدولحەمید و لە ئاکامی هێرشــەکانی تورکیای لاویشــدا دەوروبەری ملیــۆن و نیوێــک جینۆســاید کــران و (800) هەزاریش ئــاوارە و پەراگەندە بوون . هــەر بۆیە کۆماری ئەرمینیا، لــەم چەنــد ســاڵەی دوایی، ئــەم ڕۆژەی بــۆ یادەوەریی گەورەترین کارەساتی جینۆساید تەرخان کرد کە دەرهەق بە ئەرمەنەکان کراوە[17].

لە ســاڵی 1933 یشــدا حوکمڕانێتی ئەوسای عێراق لە ناوچەی (ســمێل)ی ســەر بە پارێزگای (دهۆک)ی ئێستا

زیاتر لـە (4) هەزار کەسـی لە ئاشـووریەکان ئیبادە و قڕکرد.
لـە شـەڕی نێوخـۆی ئیسـپانیادا (1936 1939-) فرانکـۆی دیکتاتۆری ئەو وڵاتە، بـووە هۆی لە ناوبردنی سـەدان هەزار کەس، بە تایبەتی لە شـارەدێی (جێرنیکا) کە بـووە سـەرچاوەی ئیلهامی پابلۆ پیکاسـۆ، لـە تابلۆ بەنێوبانگەکەیدا.
1939تـا 1945، ماوەی شـەڕی دووەمی جیهان بوو، (18) ملیۆن لە خەڵکی شارستان ئیبادەکران لەوانە نزیکەی (700000 وە) ملیـۆن یەهودی و بە ملیۆنەها رووسـی و پۆڵۆنـی و بە سـەدان هەزار فەرەنسـی و هۆڵەندی و یۆگسلافی و...... هتد (18).
لە 1948دا ئیسرائیل لە (دێرياسین) دا قەسابخانەیەکی نایـەوە و (252) کەس لە ئاکامدا تارومارکران؛ هەروەها لە 1979دا لە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاسـتدا بۆکاسای دیکتاتۆر، سەرپەرشـتی کوشـتن و خنکاندنی بە کۆمەڵی نزیکەی (100) منداڵی کرد[19].
نموونەی دیکەیش زۆرن، لەو ئیبادە و کۆمەڵکوژییانەی کـە دیکتاتۆرە داخ لە دڵە ڕەگەزپەرسـتەکان بەرامبەر بە گەلان کردوویانە وەک ترۆخیلۆس و شاوشیسکۆ و سەدام و کاسترۆ و رادۆڤان کاراڤیچ، کە ئەوەی دواییان بەناوی (پاکسـازیی ڕەگەزایەتی)یـەوە ئیبادە و قەتـڵ و عامێکی

بەرفراوان و کەم وێنەی بەرامبەر بە گەلی ئاشتیخوازی بۆسنە ئەنجام دا بەتایبەتی لە شاری (سربرینتسیا) کە چل هەزار مرۆڤی تێدا ڕەشکرایەوە.

**دووەم :**

**نموونەی جینۆساید لە نێو کورددا :**

پەیوەندی کورد بە جینۆسایدەوە لە 1987و1988 ڕا دەست پێناکات، ئەو کاتەی کە ڕژێمی دیکتاتۆری بەغدا بەشێوەیەکی بەربلاو، چەکی کیمیایی لە دژدا بەکارهێنا، بەڵکو زۆر لەمە کۆنترە و باوو باپیرانمان هەر لە ڕۆژگاری میدییەکانەوە لە چەندین سەدەی پێش زایین، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەشداری بەشێکی زیندووی شارستانێتی ئینسانیان کردووە و هەمیشە پاڵپشت و هاوکاری گەلان بوون، کەچی لەسەر (داوا) ی مافی ئینسانی و کەلتووری و نەتەوەیی ڕەوای خۆیانەوە، بەردەوام لەسەر نەخشەی نەتەوە و گەلانی دنیادا هەوڵی ئیبادەکردن و سڕینەوەیان دراوە .

ڕەنگبێ بوونی چەندین تێرم و موفرەداتی وەک (قڕکردن، ئیبادە، ڕەشکوژی، قەتڵ و عام، لەنێوبردن، قەلاچۆکردن، فەناکردن، بەکۆمەڵکوشتن، تەفروتووناکردن، کۆکوژی، تار و مار ... هتد) لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا و وەک گوزارشت و دەربڕین لە حاڵەتی (جینۆساید) و

بەکارهێنانیــان لە ئەدەبیات و داســتانەکانی قارەمانێتیدا، هەر لەو مەغزایەی سەرەوەدا سەری هەڵدابێت .
ئەوەتا (کەمال مســتەفا) لەسەر حیســابی ئیبادەکردنی کورددا ناوزەدکرا و بە (ئەتاتورک)، کاتێک کە ئەفسەرێکی بچووکــی ســوپای عوســمانی دەبێــت بۆ بەرەنــگاری و بنکۆلکردنی دەســەڵاتی عوســمانی و پێکهێنانی دەوڵەتی تورکیای (نوێ!)، سەرباز و ئەفسەر و خەڵکی کورد دەکاتە وەسیلە و سووتەمەنی شەڕی تورکان، ئەویش بە قسەی بریقەدار و بەڵێنی گەورە، کە کوردیش لەو دەوڵەتە نوییەدا مافي قەبەیان دەبێت کەچی دوای دەسەلات و حوکمڕانی، مەسەلەکە پێچەوانە کەوتەوە پەیماننامەی سیڤەری ڕەفز کردەوە و دەگــەڵ دوژمنەکانی دوێنێیدا (هاوپەیمانەکان)، (پەیماننامەی لۆزان 1923) ی مۆرکرد.
لــە 1925 دا شــێخ ســەعیدی پیــران لــەرووی ئــەو باروزروفەدا ڕاپەڕی، بەڵام حکوومەتی ئەتاتورک بە ئاگر و ئاســن ڕووبەڕووی بــووەوە و دوای لــە بەین بردنی شۆڕشەکە و ڕابەرو سەرکردەکانی، قەتڵ و عامێکی نایەوە کەزیاتــر لە (40) هەزار ئیبادەکران و ســەدان هەزاریش لە (1925 - 1926) پەڕاگەندەی ئەودیو سنووران کران و لەســەر زێدی باب و باپیرانیــان هەڵقەنێندران، تەنانەت نــاوی (کورد) یش قڕکــرا و بوو بە (تورکی چیایی !!!)[20] و لەڕاپەڕینی (دێرسیم) یشدا کە تا 1942 درێژەی هەبوو،

نزیکەی (90) هەزار گوند لەسـەر دەستی مستەفا کەمال قڕکران [21].

ئـەم بـارە، لەڕۆژگاریکی وەک ئەمـڕۆی مافی مرۆڤدا، شتێکی ئەوتۆ نەگۆڕاوە و پلانی ئیبادەکردنی کورد هەروا لـە گۆڕێیە و کوردسـتانی باکوور یەکبینـە لەباروودۆخی نائاسـاییدا دەژیت و لەکۆی زیاتر لـە 635 بەندیخانە و زیندان، لە تورکیادا نیوەی کەوتۆتە کوردستانەوە[22].

لەدوای شـەڕی دووهەمی جیهان لـە 1946دا بەهۆی پیلانێکـی دەوڵەتـە ئیقلیمـی و زلهێزەکانـەوە، کۆمـارە ساوایەکەی مەهاباد رووخێنـرا و لەبەرئەنجامی ئەوەدا داروەدەسـتەی شای ئێران چەندین قەتڵ و عامیان نایەوە ئەوەش لەسـەر رێوڕەسـمی باپیـرە گەورەیەوە کە هەر لەسـەدەی شـانزدەهەمەوە سیاسـەتی (تەهجیر)ی وەک شـێوەیەکی تواندنـەوە و لەناوبردن بەرامبـەر بە کورد پیادەکرد [23].

لـە 1979 یشـدا کاتێک گەلانی ئێران لـە دژی زوڵم و سـتەمی شـادا ڕاپەڕین، نزیکـەی (8) ملیۆن کـورد لەو شۆڕشـەدا پشکدار بوون و ڕۆڵیان نیشاندا و قوربانییان دا، کەچی حوکمڕانانی نوێی ئێران دەرهەق بە کورد هەر هەمان سیاسەتی پێشوویان پێرەو کرد و هەر لە 1983 دا (59) کەسیان بەیەکەوە لە سێدارەدانکرد و ئێستاکە زیاتر لە (200) هەزار سـەرباز و (3) هەزار بنکەی سەربازی

له ئێران نیشتەجێ و جێگیرن بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی تواندنەوە و لە باربردن و قڕکردنی کورد [24].

هەموو ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی کە لە کوردستانی عێراقدا بەرپاکراون، دژ بە سیاسەتی تواندنەوە و لەنێوبردنی چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردەواری بووە؛ بەتایبەتی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموودی نەمر و بارزان لە سییەکان و چلەکانی ئەم سەدەیە و شۆڕشی ئەیلوولی نیشتیمانی (1961) وڕاپەڕینی 1991، کە ئەمەی دادێت چەند نموونەیەکی ئەو جینۆسایدانەیە:

لە (9)ی حوزەیرانی 1963 دا بەعسییەکان بەسەرکردایەتی زەعیم (سەدیق مستەفا)ی تاوانبار، ڕەشەکوژییەکی وەحشیگەرانەیان لەشاری سلێمانیدا نایەوە و بێ لێکۆڵینەوە و دادگایی، نزیکەی (360) کەس لە سێدارەدان کران و لە شوێنێکدا نێژران کەلە دواییدا بە (دەشتی مەرگ) نێوبرا، ئەمەجگە لەوەی دەیان کەس لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدان گیانیان لەدەست داوە و لە 24/ 4/ 1974 دا ئیبادەی 131 هاوولاتی لە مامۆستاو قوتابی و ئیدی، لە شاری قەلادزێدا کرا و هەر لەهەمان ساڵدا (90) کەسی بێ گوناه لە گەلالە و چۆمان و (42) کەس لەهەڵەبجە، بە هێرشی فڕۆکەکانی بەعس بە ناپاڵم و بۆمبی فسفۆر لە نێو چوون[25].

لە ساڵی 1983 دا (8تا12) هەزار بارزانی ئیبادە و شوێن

بزرکــران، و له 1971 و 1980 بەدواوە، بەدەیان هەزار کــوردی فەیلی تەهجیر و شــوێن بزر کــران و له 1987 دا گوندی مەلــەکان (هەولێر) ئیبادەکرا و گوندی (چیمەن -کەرکووک) بەتەواوی بەســەر ســەری دانیشتووانی دا ڕوخێنراو له حوزەیرانی 1988 دا (600) کەس لەوانەی کە له کەرکووک تەهجیر و دوورخرابوونەوە بۆ ناوچەی ڕومادی له باشووری عێراق، له سێدارەدانکران[26] و هەر له هەمان ساڵدا له چەند هێرشێکی (ئەنفاله بەدناوەکانەوە) (182) هەزار کەس، بەدەستی ڕژێمی دیکتاتۆری بەغداوە، جینۆساید کران....هتد .

لەولاتــر و لەهەوڵێکی ڕەشــکردنەوە و ئیبادەکردندا، له ساڵی 1962 دا حکوومەتی سووریا ویستی ئاماری گشتی دانیشتوان بکات، بەڵام کوردەکانی ناوچەی جەزیرەی لێ دەرهاویشت و بەو پێیە هەموو مافەکانی (هاوولاتیتی) لەو کوردانە سەندرانەوە بە ناسنامە کۆنەکانیشەوە، لەکاتێکدا (ئەرکی سەربازی) یان لەسەر بوو و له سوپای سوریادا له ســالانی 1980 و 1982 دا بەزۆر وەک داردەست له دژی ئەم و ئەو بەکاردەهێنران [27].

لــە ســاڵی 1963یشــدا وەک پاســاوێکی هەوڵەکانــی ئیبادەکردنی گەلی کورد، حکوومەتی ســووریا سیاسەتی (پشــتێنەی عارەبی) داهێنــا و بەهۆیەوە ناوچەی جەزیرە بــە درێژایی ســنووری تورکیا (15کم پانــی و 280 کم

درێــژی) بڕیاری چۆڵکردنی داو لە ئەنجامی ئەوە (332) گوندی کوردنشین تەهجیر کران و لەشوێنیاندا و بەناوی دامەزراندنی باغ و بێستان، عارەبەکانی تێدا نیشتەجێ کران و ناوچەکە تەعریب کرا و ســەرچاوەی ئەم سیاسەتەش (محەمــەد تالب جــەلال) ناوێک بووە کە لە شەســتەکاندا ئەفســەرێکی گەورەی ئەمنی ســووریا بووە و لەوکاتەدا کتێبێکــی بەنــاوی (لێکۆڵینەوەیەک دەربــارەی پارێزگای جەزیــرە لەســەر ئاســتی تایەفەگــەری و کۆمەلایەتی و سیاســی) نووسیوە و تێیدا مەترسی لەبوونی کورد دەکا و داوای ئیبادە و جینۆسایدکردنیان دەکا[28].

## پشکی چوارەم :
## ناساندنی جینۆساید وەک تاوانێکی نێودەوڵەتی

بەکۆمەڵکوژیــی بەدرێژایــی مێــژوو، نەمــازە لەوەختی شــەڕی دووەمــی جیهانــدا، هەموو ســنوور و تخوبێکی بەزاند، چ لەڕووی چەندێتییەوە یا لەرووی چلۆنایەتییەوە. بە ملیۆنان خەڵک ڕەشکرانەوە و بەڕشتبوونەوە، دووجار بۆمبــی کوشــندەی ئەتۆمــی قەدەغەکــراو، لەلایەن وڵاتە یەکگرتووکانی ئەمریکاوە لە 6و9ی ئابی 1945 دا بەکار هێنرا.

ئەمانــە هەمــووی وای لە چەنــد دەوڵەتێکی وەک (کوبا و هینــد و پەنەمــا) کــرد کە پێشــنیارێک بخەنــە بەردەم کۆمەڵەی گشــتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەو مەبەســتەی لــە جینۆســـاید بکۆڵرێتەوە و وەک تاوانێکــی نێودەوڵەتی بناســرێت و مەحکووم بکرێت. ئەوەبوو کۆمەڵەی گشتی پێشــنیارەکەی لــە 1946/11/9 بــە لێژنــەی یاســایی

ئەسـپارد و ئەویش لە هەمان مانگدا توێژییەوە تاکو بوو بـە پڕۆژەیەک و لە 1946/12/11 دا وەک (بڕیار)ێک لە کۆمەڵەی ناوبراوەوە دەرچوو کە تێیدا دەڵێ: جینۆسـاید تاوانێکە بەپێی یاسـای نێودەوڵەتـی و نکۆڵیکردنی بوون و ژیانـی تەواوی کۆمەڵ و گرووپی ئادەمییە، کە ئەوەش سـتەمێکە دەرهـەق بـە ویژدانـی گشـتی و ڕەوشـت و بنەماکانی نەتەوە یەکگرتـووەکان؛ دەگەڵ ئارمانجەکانیدا دژ و ناکۆکە و دنیای شارستانی مەحکوومی دەکات[29].

دوای ئـەوە کۆمەڵەی گشـتی، ئەنجومەنـی ئابووری و کۆمەڵایەتـی ڕاسـپارد کـە پـڕۆژەی ڕێککەوتننامەیەک سـەبارەت بە قەدەغەکردن و سزادان لەسەر جینۆساید، ئامادەبکات، بەپێی ئەوە ئەنجوومەنی نێوبراو ئەسپاردەکەی بەجێهێناو پڕۆژەی (ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی تاوانی کۆمەڵکـوژی و سـزادان لە سـەر ئەنجامـدان) ڕەوانەی کۆمەڵەی گشـتی کردووە ئەویش بەژمارەی 260 ئەلیف (د-3) لە ڕۆژی 1948/12/9 بڕیاری لەسەر دا، بۆئەوەی بەپێی بەندی سێزدەمین، دوای واژووکردن و چوونەریز و بڕوایـی پێدانـی دەوڵەتـان، لـە 12ی کانونی دووەمی 1951 دا پیادەبکرێت[30].

بەندی دووەمـی ڕێککەوتننامەکە، بەم شـێوەیە تاریف وپێناسەی جینۆساید دەکا کە وێ دەچێ کاریگەریی دوو بۆمبـە ئەتۆمییەکەی بە سـەرەوە بێت: هـەر کارێکی کە

بەمەبەستی لە نێوبردنی هەموو یان بەشێکی کۆمەڵێکی ئادەمیی لە سۆنگەی نیشتیمانپەروەریی یان ڕەگەزایەتی یاخود جیاخوازیی یان ئایینییەوە ئەنجامدرابێت، بە جینۆساید دەژمێردرێت .

لە دیباجەی ڕێککەوتننامەکەشدا، دەوڵەتە واژووکارە ڕێککەوتووەکان باوەڕ دێنن بەوەی کە دەرباسکردنی ئادەمیەت لە بابەتی وەک ئەو پەتایە تووشە ئالیکاری نێودەوڵەتی، گەرەکە.

هەروەها دەوڵەتانی لایەن لە ڕێککەوتننامەکە، بۆئەوەی بڕ و بیانوو و پاساوی تاوانکاران ببڕن و هیچ بوارێکی زەمەنی بۆ ئەنجامدانی ئەم گەورە کەتنە نەهێڵنەوە کە تاوانکاران خۆیانی پێوە هەڵواسن؛ لەبەندی یەکەمی ڕێککەوتننامەکەدا باوەڕیی دێنن بەوەی کە جینۆساید ئەگەر لە ڕۆژانی ئاشتی ئەنجامدرابێت یان لەکاتی شەڕدا ئەوا جیاوازی نییە و سزا بەسەر ئەنجامدەرانیدا دەسەپێنرێت.

## پەراوێزەکانی پاری یەکەم

(1) بڕوانە: د. عبدالوهاب حومد، الاجرام الدول، مطبوعات جامعة الكويت. الطبعة الاولى، 1978، ل237.
(2) هەمــان ســەرچاوەی پێشــوو، ل238 . هەروەها د.حســنين ابراهيـم صالح عبيد، الجريمة الدولية/ دراســة تحليلية تطبيقية، دار النهضة العربية، الطبعة الاولى، القاهرة، 1979، ل262.
(3) د. حسنين ابراهيم صالح عبيد، سەرچاوەی پێشوو، ل151.
(4) هەمان سەرچاوە، ل 147.
(5) هەمان سەرچاوە، ل 224.
(6) هەمان سەرچاوە، ل235.
(7) هەمــان ســەرچاوە، ل 148، هەروا پەراوێــزی (1) لەهەمان لاپەڕەدا .
(8) هەمان سەرچاوە، پەراوێزی (3)، ل255 و 256.
(10) سەرچاوەی پێشوو، ل 149.
(11) سەرچاوەی پێشوو، پەراوێزی (3) ل 266.
(12) بسام العسلی، الحرب والحضارة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر/ الطبعة الاولى، بيروت، ل138.
(13) هەمان سەرچاوە، ل19.
(14) هەمان سەرچاوە پەراوێزی (2)،ل31.
(15)الحملــە العالميــة لحقوق الانســان، حقوق شــعوب الســكان الاصليين، صحيفــة وقائع رقــم (9) مركز حقوق الانســان، جنيف. 1990، ل1و2.
(16)مجموعــة من الخبراء، الموســوعة العربية الميســرة، الطبعة

الثانية، بيروت 1972، ل696 و ل1139.

(17)هەمان ڕۆژ (1974/4/24) لەنێو کوردی باشووری کوردستاندا، وەک ڕۆژی شەهید تەرخانکراوە، ئەوەش لە یادەوەری هێرشی فرۆکەی بەعس بۆ سەر زانکۆی سلێمانی لە قەڵادزێ کە 131کەس ئیبادە و شەهید بوون.

(18)د. حسنين ابراهيم صالح عبيد، پەراوێزی (2)، ل 255، هەر لەو بارەیەوە مارشاڵ(گۆرنگ) ی فەرماندەی هێزی فڕین و جێگری هیتلەر، دوای گەمارۆدانی شاری لینینگراد دەڵێ: نزیکەی 20تا30 ملیۆن کەس لە ڕوسیادا لە برسان مردن. ڕوودانی ئەوەش کارێکی چاکە، چونکە پێویستە هەندێ میللەت ئیبادەبکرێن و هەر لە ئێستاوە ئێخسیرەکانی رووس وا یەکتری دەخۆن. بۆ زانیاری زیدەتر بڕوانە : د. عبدالوهاب حومد، ل ل 98و99.

(19)حقوق الانسان/ نشرة شهرية تصدرها لجنه الدفاع عن حقوق الانسان في العراق، ژمارە (3)، 1988. ل7.

(20) حميد بوز ئەرسلان، حول الاطروحة التركية في التاريخ، دراسات كردية، ژمارە (3-7)، پاريس، 1992، ل38.

(21) جبهة التحرير الشعبى الثوري، الشعب الكردي حقيقة، ل70.

(22) علي اكبابا / الوضعية في السجون التركية، دراسات كردية، ژمارە /4 (8)،1993، ل128.

(23) وليم ايكلتن، خمسة و ثلاثون عاما من عمر الصداقة مع الاكراد، سەرچاوەی پێشوو، ل 89 .

(24) حسن شرفي، سلمية الشعب الكردي في ايران وعدوانية الحكومة المركزية/ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل131.

(25) د.محمود عثمان، الاكراد في العراق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل60.

(26)سەرچاوەی پێشوو، ل60.

(27)عصمت شــريف وانلــي، الاكراد في ســوريا و لبنان، هەمان سەرچاوە، ل68 و ل70 .
(28)هەمان سەرچاوەی ل69.
(29)د.عبدالوهاب حومد، ل238 و ل239 .
(30)د.حسنين ابراهيم صالح عبيد، ل261 و ل262 .

## جینۆساید بە مەفهوومە فراوانەکەی، یان ڕێگاکانی ئیبادە کردن

جینۆسـاید بـە تەنهـا بریتـی نییە لـە قەتـڵ و عامێکی ڕاسـتەوخۆی ئێکسـەرە، بەڵکـو پلانێکـی داڕێـژراوی بەروەختـە، بـە نیـاز و هلۆڤانیی و ئیـرادە و پێزانینەوە، بەڵکـو لـە نێوبردنـی کۆمـەڵ و گرووپێکـی دیاریکـراو ئـەوەش مەرج نییە هەر بە تاقە شـێوازێک ئەنجامبدرێت بەڵکو تاوانکاران بـۆ بە ئاکام گەیاندنی تاوانەکەیان، نیاز و نیەتیـان بـە ئاقاری چەندین ڕێـگا و میتۆددا ڕۆییوە و دەچێـت، هەروەک بەنـدی دووهەمـی ڕێککەوتننامەی لە نێوبردنی جینۆسـاید ڕۆشـنی کردۆتەوە. لـەو پارەدا بە کورتـی ئاماژە بەو ڕێگایانە دەدەین و بۆ ئەم مەبەسـتە ڕژێمی فاشـی عێراق (تاوانکار) و کورد (تاوان لێکراو) لە

ماوەی دوای کودەتای 1968 بە گشـتی و دوای 1975 بــە تایبەتی، هەتا دوای راپەرینی 1991 دەکەینە مەیدانی لێتوژینەوە.

لێرەدا جینۆساید بەو رێگا و میتۆدانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت کە یەکە یەکە لێیان دەدوێین و لەو مەبەستەدا ئەو پارەمان بۆ سەر پێنج پشک، بەو رەنگە دابەش کردووە:

## پشكی یەكەم:

## كوشتن و قەتڵ و عامی راستەوخۆ :

ئەم رێگایە بە مەترسیدارترینی شێوازەكان دەژمێررێت چونكــە دەســتدرێژی و ئێنكاركردنــی (مافــي ژیانە) ئەو مافــەی كە لە بەندی ســێیەمی جارنامــەی جیهانی مافي مرۆڤ و برگەی (1) لە بەندی (6) ی پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە رامیاری و بازێرڤانییەكان پارێزراوە.

كوشتن و قەتڵ و عامی راستەوخۆ، بە هۆی قەسابخانە نانەوە بە هەر وەســیلەیەك بێت ئەنجامدەدرێت هەروەها لە رێگای وێرانكردن و خاپووركردنی دێیەك یا شــارێك بە سەر سەری خەڵكەكەیدا وەك (هێرۆشیما و هەڵەبجە و ناكازاكی و جێرنیكا...) لێرەشدا تاوانەكە هیچ جیاوازییەكی نابێــت ئەگەر، دەرهــەق بە گرووپێك بكرێــت هەموویان پیاو بن، یا ئافرەت و پیر و پەككەوتەشــیان لەگەڵ دابێت، هەروەهــا ئەگــەر قەتڵ وعامەكــە تــەواوی گرووپەكەی

گرتبێتـــەوە یـــان هەندێکی وەکــو یەکە، جگە لـــەوەش لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا رەچاوی تەمەن و رەگەز و گەورە و بچووکی ناکرێت[1].

بەو پێودانگە، رژێمی بەعس، وەک هەوڵێکی رەشکردنەوە و بنبڕکردن، زۆر کوشتار و قەتڵ و عامی لە کورد کردووە، کە لە بن نایەن و لێرەدا تۆمارکردنیان کارێکی ئەستەمە، بۆیـــە تەنها چەند نموونەیەکـــی ئاماژە ئامێز دەخەینە بەر تیشکی توێژینەوە .

**یەکەم :**

**لە سێدارەدان و لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ**

ئەم تاوانە دەرهەق بە خەڵکی بێگوناه هەروا لە گۆترە، بێ رەچاو کردنی رێورەســـمی دەسگیرکردن، بێ لێکۆڵینەوە، بێ دادگایی یان دادگایی رووکەش و کورت ئەنجامدراوە، لـــە کاتێکدا زۆربەی بڕوانامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ بە گوێرەی ئەو دەوڵەتانەی کە سزای لە ســـێدارەدان کردنیان هێشتۆتەوە تەنها لە خەتەرناکترینی گـــەورە کەتنەکاندا رێگایان پێـــدراوە کەچی رژێمی عێراق لـــە 1976 ـەوە هەتا 1987 لە (29) حاڵەتاندا رێگا بە لە سێدارەدانکردن دەدات، کە زۆربەیان پەیوەستن بە خودی ســـەرۆکی رژێم و حیزبی بەعســـەوە، لە خۆچەسپاندن و نەهێشتن و ئیبادەکردنی حیزب و لایەنەکانی ئۆپۆزیسیۆن

و چین و توێژەکانی گەلی کورد[2].
لەوەشدا ڕێگای بە لە سێدارەدانکردنی کەمتر لە تەمەنی یاسـایی داوە، یـا بە زۆر تەمەنیان زیـاد کراوە، کە ئەوە پێچەوانـەی خـودی یاسـاکانی عێراقـی و نێودەوڵەتییە، ڕاپۆرتـی ڕێکخـراوی لێبوردنـی گشـتی سـاڵی 1987 سـەدان حاڵەتی لـەو بابەتەی تۆمار کـردووە، هەروەها دادگاکانـی عێراقی نەمازە ئەو دادگایانەی کە تەماشـای بە ناو تاوانە سیاسـییەکان دەکەن، دادگای نائاسـایین و سـتافە دادوەرییەکەی لە عەسـکەرییەکان پێکهاتوون، لە وانـەی کە دوورن لە شـارەزایی و ئیلتزامـی قانوونی و تـاوان دراوە پـاڵ تێیدا مافي داکۆکی لـە خۆکردنی نییە، هەروەها مافي هەڵوەشاندنەوەی (حق النقض) بڕیاری لە سـێدارەدان هەر بۆ (سـەدام حوسـێنە و تـا کار بەوەرا گەیشـت سـەدام بە سیفەتی ڕەئیسـی مەجلیسی قیادەی سەورە بڕیاری ژمارە (700) لە 1988/8/27دا دەربکات کـە تێیدا مافي بڕیـار و جێبەجێکردنی خێراو دەسـت و بردی لە سـێدارەدانکردن بە (منضمـة) حیزبییەکان دەدا، لە مەسـەلەی فیرار و تەخەلوفي عەسـکەریدا!! کە لە ژێر ئـەو پەردەیـەدا، ڕۆژانـە دەسـتەجەمعی لاوی کورد لە ئۆردوگا سـەربازی و ڕێکخـراوە بەدناوەکانی بەعس لە سێدارەدەدران. (بۆ دەقی بڕیارەکە بڕوانە پاشبەند).
لـە 1987/12/12 دا، مەکتەبـی تەنزیمی شـیمال هی

حزبی بەعس کیتابێکی بە ژمارەی ( 6806) و بە ئیمزای (عەلـی حەسـەن ئەلمەجیـد) دەرکرد کـە ناوەڕۆکەکەی مل پەڕاندنی ئەندامانی سـێ خانەوادەیە لە کەسـوکاری نەیارانـی بەعس، کـە زوو بە زوو، بـە خێرایی جێبەجێ کرا، هەروەک حوکمی لە سـێدارەدان بەسەر ئەوانەیشدا پیادەکـرا کـە بەپێـی بڕیـاری لێبووردنـی 1988/9/6 هاتبوونەوە و خۆیان تەسلیم کردبۆوە[3].

لـە سـێدارەدانی (100) تـا(150) کـەس لـە 11 ی تشرینی دووەمی 1987دا لە گوندی چیمەن (کەرکووک) هەروەهـا 23 کەس لە شـەقڵاوەی سـەر بـە پارێزگای هەولێـر لە هەمان مانگ و سـاڵی ناوبـراودا و نموونەی لە سـێدارەدانکردنی بێ دادگایین. لەوانەی دیکەش کە لە سێدارە دراون لە 18 ی تشرینی دووەمی 1987 دا (31) کەس لە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کورسـتان – عێراق (دوای دادگایی کردنی سەربازی !) لە سێدارە دراون[4] و لە 15 ی کانونی دووەمی 1987دا (29) منداڵ (زارۆک) لە کۆی (300)یاندا لە شاری سلێمانی بە سێدارە قڕ کران و داوای خەرجیـی لە سـێدارەدان و تەسـلیم کردنەوەی تەرمەکانیش لە خێزانەکانیان کرا[5].

بەپێی گەواهی شـایەدێکیش لـە پایزی 1986 دا، (19) تۆلازی کورد دوای ئەوەی دەسـت و چاویان بەستراوە، پێکەوە لەشیان وەک بێژینگ کون کون کراوە و نەهێڵراوە

وەک خوونەریتــی ئایینــی بشــۆردرێن و بــە جلــەوە لە گۆڕنراون[6]..

**دووهەم:**

**جینۆساید لە ڕێگای بەکارهێنانی ژەهرەوە:**

بە پێی زانیارییەکانی ئەمنستی ئینتەرناشنال، لە تشرینی دووەمــی 1987 دا ڕژێــم لە ڕێــگای ئافرەتێکی بە کرێ گیراوەوە کە نێــوی (نەرمین حەوێز) بووە نزیکەی (50) کەس لە هاوولاتی و حزبە نەیارە کوردییەکان، بە مادەی (ئالیۆم) قڕو سەقەت کردووە[7]، هەروەها لە 1988/6/8 دا و لــە کاتــی ئەنفالەکانــی بادینــان و دوای ڕەوکردنی ژمارەیەکــی فــرە بۆ تورکیا و ئێــران، توانی لە ڕێگای بە کرێ گیراوەکانیەوە لە یەکێــک لە ئۆردوگاکانی تورکیادا نان ژەهراوی بکات و لە ئاکامیدا نزیکەی (2) هەزار کەس تێبچن[8].

**سێیەم:**

**فڕۆکە و چەکی تەقلیدی:**

باڵەفڕەکانــی ڕژێم هەر کاتێک کە هێرشــیان بۆ ســەر ئاســمانی کوردســتان هێنابێــت، ئــەوا خــاڵ و شــوێنە شارســتانی و بێ دیفاعەکان ئامانجی ســەرەکییان بووە، لە ساڵی 1974 دا فڕۆکەکانی ڕژێم قەتڵ و عامی (131)

کەســی بێ گوناهیان کرد لە شاری قەڵادزێ (سلێمانی) و هەر لە هەمان ســاڵدا (90) کەس لە ئاکامی بۆمبی ناپاڵم و فســفۆری قەدەغەکراو، لەســەر پردی گەڵاڵە (هەولێر) جینۆســاید کران و لە 1987دا فرۆکە جەنگییەکانی ڕژێم بە بیانووی شــەڕی عێراق – ئێران – ئۆردوگای زێوەی ئاوارەکانــی کوردســتانی عێراقیــان کوتاو لە هێرشــێکی بەربەریانەدا، بە تایبەت بۆ ســەر قوتابخانەی ئۆردوگاکە نزیکــەی (350) منداڵی تەمەن (6-12) ســاڵی تێدا ئیبادە بوو[9].

هەروەها لە ســاڵی 1985 ڕژێم بە فرۆکەی هێلیکۆپتەر و ســەمتی، بۆردومانی کۆمەڵێک شاری کوردستانی کرد کە لــە ژێر ئیــدارە و کۆنترۆڵــی خۆیشــیدابوون لەوانە: هەولێر، مووسڵ، زاخۆ، سلێمانی[10]. جگە لەم هێرشانەی دوای ڕاپەڕینــی 1991 کە لە هەموو لایەک ئاشــکرایە و بە سەدان و هەزاران کەس کەوتنە بەر شاڵاوی ئیبادە و ڕووبەڕووی چارەنووسی مان و نەمانیان بوونەوە.

چەکــی تەقلیدی کــە ڕژێمی عێراقی بە ســەدان جار بە کاری هێنــاوە چ وەک بۆمبی ناپاڵــم کە چەندین پارچەی لێدەبێتەوە و زیانی گیانی و ماڵیی گەورەی لێدەکەوێتەوە، چ وەک میــن و تــی ئێن تــی، یاخود بۆمبی فســفۆری و هێشــوویی، یا تــۆپ و هاوانی جۆرا و جــۆر، هەموویان قەدەغــەن و بەشــێکی ئــەم چەکانــە لە کۆنگــرەی مافی

مرۆڤی نێودەوڵەتیی لە تاران (1968) گفتوگۆی لەســەر کراوە و ڕێککەوتننامەیەک و (3) پرۆتۆکۆلی نێودەوڵەتیی دەربــارەی قەدەغەکردنی ئەم چەکانە مۆر کراوە؛ چونکە بەکارهێنانــی ئەم چەکانە وەک لە پێکهاتەکانیان ڕا دیارە، زێتــر ڕووبــەڕووی خەڵکی مەدەنی دەکرێنــەوە و زیاتر زەرەر بــە ئــەوان دەگەیێنی، وەک لە نێوانی دوو ســوپا یا هێزی چەکــداری دوو دەوڵەتدا بەکاربێت، هەروەها لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە چەکانەدا تەڕ و وشــک بە یەکەوە دەسووتێ، واتە کارەساتێک لە شێوەی ئیبادەی جەماعیدا ڕوودەدا و بریندار و پێکراوەکانیش ئەوەندە زۆر دەبن کە چارەسەرکردنیان زەحمەت دەبێت و لە توانای دەوڵەتان بەدەر دەبێت[11]. کەچی لەگەڵ هەموو ئەو پێزانینانەشــدا، بەرشتبوونەوە ڕژێم هەموو ئەو چەکانەی لە دژی کورددا وەکار خست.

**چوارەم :**

**چەکی کۆ کوژی کیمیایی :**

ڕژێــم لە نەخشــە و پلانێکــی نوێی دیکەدا کــە هەموو کوردســتانی گرتەوە و پێی وا بوو کە کورد بەرەو کۆتا دەبــات، چەکی کوشــندە و کۆکوژی کیمیایــی بەکارهێنا، بەوەش سەدام حسێن تخوبی ئەڵمانەکان و بەریتانییەکانی، (شەڕی یەکەم) هەروەها ئەمریکییەکانی (شەڕی دووهەم)

بەزاند، چونکە ئەوان چەکی ئیبادەی جەماعیان بۆ گەلانی تـر بەکارهێنـا کەچی سـەدام بـۆ گەلێکـی بەکارهێنا کە رەگەزنامەی عێراقییان هەڵگرتبوو.

لـە مێـژە کۆمەڵگای نێـو دەوڵەتـی بەکارهێنانی چەکی کۆکـوژی وەک کیمیایی قەدەغە و تەجریم کردووە و بۆ یەکەمین جار لە جاڕنامەی (سـان پیترسبۆرگ) لە ساڵی 1868 باس کراوە، لە ژێر ناوی قەدەغەکردن و سـنوور بـۆ دانـان لەبەکارهێنانی ئەو چەکانەی کە نائینسـانین و موعانـات و ئـازار بۆ چەکدار و سـەربازەکان دەنێنەوە، کە هیچ پاسـاوێکیان بۆ نییە، یا ئەوەتا ژیانی دانیشـتووە بازێرڤانییەکان دەخاتە مەترسییەوە[12]..

لـە دوای ئـەوە هەرتک رێککەوتننامەی لاهای سـالانی 1899 و 1907 لـە بەنـدی (1/23)ی هەردووکیانـدا ئـەم چەکەیان لە ژێر نـاوی (بەکارهێنانی ژەهر و چەکی ژەهراوی) دا قەدەغەیان کردووە[13]..

هەروەها پەیمانی ڤێرسای (1919) هەمدیس باسی لێوە کردووە:

وردتر و تەرخانی تریش لە وانەی سەرەوە، پرۆتۆکۆلی (جنێڤ)ی سـالی 1925 ـە بۆ بەر لێگرتن لە بەکارهێنانی گازە خنکێنـەر و ژەهراوییـەکان و مەوادە میکرۆبییەکان لە شـەڕدا، ئەم پرۆتۆکۆلە کـە (113) دەوڵەت بڕواییان پـێ داوە و لـە 17 ی تەمـوزی 925 لەلایـەن دەوڵەتـە

هاوبەشــە ڕێککەوتووەکاندا کە زلهێزەکانیشی تێدا بووە، واژوو کراوە، ئەمــەش دوای ئەوەی کە خەتەرناکیی ئەم چەشنە چەکانە لە کاتی بەکارهێنانیاندا لە شەڕی یەکەمدا دەرکەوت، کاتێک کە ئەڵمانەکان لە دژی فەرەنساییەکاندا بەکاریــان هێنا و قوربانییەکانی گەیشــتە نزیکەی (100) هەزار کوژراو و ملیۆنێک بریندار[14].

لە دوای ئەم پرۆتۆکۆلەش، لە ڕوانگەی بە تەنگەوەهاتن و جەختکردنەوە، کۆنگرەی گشتی چەک داماڵین کە ساڵی 1933 لە جنێف بەستراوە و بڕیاری کۆمەڵەی گەلان کە لە 1934/9/14 دا دەرچووە، تەئکیدیان کردۆتەوە[15].

بەو ڕەنگە هیستریای سڕینەوە و ئیبادەکردنی کورد لە پارچەی عێراقدا، وای لە ڕژێمی بەغدا کرد کە ســەرپێچی هەمــوو بەڵگەنامــەکان بــکات و هەمــوو پابەندبوونێکی یاسایی و نێودەوڵەتی و ئەخلاقی بەلاوە بنێت و ئابڕووی کەرامەتــی مرۆڤایەتی ببات و وێنــەی ئیبادە و قڕکردنی چاخە تاریکەکانی دەیان سەدەی لەمەوبەر زیندوو بکاتەوە و کورد بە چەکی کۆکوژی کیمیاوی تار و مار بکات.

ڕژێم وەک جێبەجێکردنێکی بڕیاری ڕۆژی 1987/3/29ی مەجلیسی قیادەی سەورە: بۆ یەکەمین جار ئەم چەکەی لە شێخ وەسانان و دۆڵی بالیسان (هەولێر) لە 1987/4/15 دا لە شــێوەی گازی خــەردەل بەکار هێنا کــە لە ئاکامی ئەوەدا نزیکەی (500) کەس شــەهید و بریندار بوون، بە

مانای (109) کەس ئیبادە و (380)یش پێکراو، ئەندامێکی پێشووی موخابەراتی عێراقی دەربارەی هێرشی کیمیایی ئــەم ناوچەیە گەواهــی دەدا و دەڵــێ: خەڵکەکە پێکراو و بریندارەکانیان بۆ نەخۆشــخانەی کۆماری، بە ئۆتۆمبێلی تایبەتــی هێنــا کە ژمارەیــان لە (380) کــەس پتر بوو و زێتــری پیرەژن و منداڵ بوون، لــەوێ لە ژێر چاودێریدا مانەوە و بە فەرمانی رژێم چارەسەرکردنیان پشت گوێ خراو هاتوچۆ و پەیوەندی پێوە کردنیشیان قەدەغە کراو دوای ئەوەی رۆژێک مانەوە لە شەوی دووەمدا لە یەکێک لــە بینایەکانی شــاری هەولێر زیندانی کران و لەوێشــدا چەنــد رۆژێک مانەوە و پاشــان بۆ شــوێنێکی نادیاریان بردن، بەڵام شاهێد هەیە کە لە نزیک بەندیخانەکەدا بووە دەڵێ: هەموویان زیندە بە چاڵ کران[16].

لــە دوای ئەوەدا لــە 1987/5/27 دا گونــدی مەلەکان (رەوانــدوز- هەولێــر) کــە 85 کــم لە ســنووری عێراق – ئێرانــەوە دوورە و ژمارەیــان 49 کــەس بووە، چەند فڕۆکەیەکــی جەنگی عێراقی هاوکات لەگــەڵ بۆردومانی دوو گونــدی دیکــەدا (بلــە، گنــدۆک) بــە گازی خەردەل تــەواوی ئەو 49 کەســـەیان جینۆســـاید کــردووە، دوای زیندە بەچاڵکردنی بریندارەکان[17].

لە 16 و 17 و 18 ی ئاداری 1988 دا شاری هەڵەبجە (ســلێمانی) کە دانیشــتووانی لە دەوروبەری 90 تا 110

هــەزار كەس دەبوون بە گازەكانی ســیانید و خەردەل و (تابۆن و ســارین و ســۆمان) قڕكران بە شــاری مردوو و خامۆشــان دنیــای مرۆڤایەتی هەژاند و رای گشــتی و شــەقامی دەوڵەتانی رۆژئاوای ورووژاند و رۆژنامەكانی ئەو وڵاتانە بە چڕوپڕی باسی ئەو كارەساتە كەم وێنەیەیان كــرد[18] و ئەگەر هێز و فشــاری گەلانی ئــەو دەوڵەتانە لە ســەر حكوومەتەكانیــان نەبوایە، نە باســی دەكراو نە مەحكوومیش دەكرا، چونكە سیاسەت و بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانــە بەرامبەر بــە عێراق، ئەوكاتە، لــەوەدا بوو كە پەردەپۆشی ئەو تاوانە گەورەیە بكەن!! .

ئەنجامــی ئەو كارەســات و قڕكردنە پتــر لە (5) هەزار شەهید و دوو ئەوەندەش بریندار بوون كە بەهری زیاتریان ئافرەت و منداڵ بوون و بە هەزارانیش پەڕاگەندەی دیوی ئێران بوون.

ئــەو ژەهرباراندنــە، بــەدەر لــەوەی كە لــە رۆژنامە و هۆیەكانــی راگەیاندنــی جیهانــی و ئەورووپی باســی لێوە كــرا، وەك ســەلماندنێك مانگــە دەســكردەكانی ئەمریكا و بەریتانیــاش وێنەیــان لێگــرت و ئــەو بڵاوكــراوە و مەنشــووراتانەیش كە رژێم بە فڕۆكە بەســەر ئاســمانی هەڵەبجەدا پەرشــی كردن و تێیدا هەڕەشەی بەكارهێنانی چەكی كیمیایی كردبوو، ئیسپاتێكی حاشا هەڵنەگری ترە. جێــگای باســە، كــە ئیبادەكردنــی كــورد، جارێكــی تر

پیادەکردنــی پرۆتۆکۆلی (جنێڤ)ی ســاڵی 1925 بە بیر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هێنایەوە، بەڵام بێ ئەوەی باســی کــورد بکرێت، کۆنگرەکە لە پاریــس لە کانوونی دووەمی 1989 و بە ئامادەبوونی نوێنەرانی 149 دەوڵەت گرێدرا، بۆ بەر لێگرتن لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و پشتەوانی لە بەجێ گەیاندنی بەندەکانی پرۆتۆکۆلی جنێف لە بەیانی کۆتایــی کۆنگرەکە کە لە (6) بڕگە پێکهاتووە، بڕگەی (3) یەمی دەڵێ:(دەوڵەتانی بەشــداربوو لە کونگرەدا پێویستی گرێدانی زووبەزوویی رێککەوتننامەیەک جەخت دەکەنەوە، ســەبارەت بە قەدەغەکــردن و بەرهەمهێنان و داکردن و بەکارهێنانــی چەکــی کیمیایی و لــە نێوبردنی ئەو چەکە، پێویســتە ئەو رێککەوتننامەیەی کە گرێ دەدرێ گشتگیر و جیهانی بێت و شایانی پیادەکردنێکی کارا بێت[19].

هــەروەک لــە کانبێــرای پایتەختی ئوســترالیا لە 19 ی ئەیلوولی 1989 کۆنگرەیەکی تری جیهانی ســەبارەت بە چەکــی کیمیایی بەســترا، بەڵام ئەمجارەیــان ناوی کورد هاتەوە گۆڕێ و وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئوسترالیا کارەســاتی هەڵەبجــە و قوربانییەکانــی وەبیرخســتەوە، هــەروەک رێکخراوی جیهانــی کارمەندانی تەندروســتی و مافــی مرۆڤ لە ســەر داوای مســتەر جان مارتنســی جێگری ئەمینداری گشــتی (UN) بــۆ مافەکانی مرۆڤ لە 24-27 مایسی 1989 دا لە جنێڤ کۆنگرەیەکیان بەست

بــۆ لێکۆڵینەوە لە کاریگەریی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی، ئەمانە هەمووی بە گوفتار بەڵام بە کردار دیارە کە شتێکی ئەوتۆ نەکرا[20].

**پێنجەم :**

**ئەنفالە بەدناوەکان :**

ئەنفــال ناوێکی دیکــەی جینۆســاید و ئیبادەکردن بوو، کە هەموو ڕێگاکانی پێشــوو و هی تریشی بە شێوەیەکی فــراوان گرتــە خۆی . ڕژێم ئــەوەی لە نێــوان 1987 تا 1989 ئەنجامیــدا ناوی نا ئەنفال، بەڵام ئەنفال لە 1983 و لــە بارزانییەکانەوە دەســت پێــدەکات، ئەگەرچی ڕژێم ئــەو ناوەیشــی لێنەنابێت، ئــەو کاتەی کە نەخشــەیەکی پیلانگێڕانەی مکومی بۆ لەنێوبردنیان داڕشت و لە قۆناخی یەکەمــدا لەســەر خاک و ئاوی خۆیــان هەلقەنێنران و لە ئــوردوگا زیندانییەکانی وەک قوشــتەپە و دیانا و هەریر ئاخنران و لە پاشــدا بە فەرمانی سەدام، هەردوو بارزان تکریتی و وەتبان تکریتی دایک براکانی سەدام، هەستان بە ڕێکخستنی هێزێکی پێکهاتوو لە فرقەی موخابەرات و چەند یەکەیەکی تایبەتی ســوپا و دەوری ئــەو ئۆردوگایانەیان گــرت و لــە 1983/7/30 دا توانیــان زیاتــر لە (8000) بارزانی لە ســەرووی (8) ساڵییەوە بگرن کە (315) یان

له نێوان 8 تا 17 ساڵیدا بوون و بەپێی گەواهی شایەدان، بەرەو باشووریان بردن و تا دەورووبەری بەغدا بینراون و پاشان ون بوون[21].

بەپێی هەندێک گۆتە، گشتیان ئیبادەکردوون و بەر لەوە خوێنیان لێ بەتاڵ کردوون و بە کۆمەڵ لەسەر سنووری عێراق – سعودیە ژێرگڵ کراون. لەوەش کارەسات تر کە وەک نەنگییەک بە نێوچەوانی مرۆڤایەتییەوە دەمێنێتەوە، بارودۆخــی ئەو ژن و منداڵانە بوو کە لەو ئۆردوگایانەدا هێشــتبوویاننەوە و دەوروبەریان بە ئەمن و موخابەرات گیرابوو و ئاو و کارەبایان بە سەردا بڕیبوون و دەستدرێژی بەردەوامیان دەکردە ســەر و ئازووقەیان لێ بڕیبوون و بەردەوام بە تەقەکردن و بە نیوەشــەو چوونە ســەریان و بە دەرگا شــکاندن، ئیرهابیان دەکردن، بەشێوەیەک کە نووســەرێکی گەورەی عێراقــی وەک (کنعان مکیە) دوای ئەوەی کارەســاتی ئیبادەکردنی ئەو خێزانانەی بینیوە بە قەناعەتەوە گوتوویەتی: هەســتم بە شەرمێکی قووڵ کرد کە تەعبیری لێناکرێ، بە خۆم شەرم بوو کە من لەعێراقدا لەدایکبووم[22].

لــە دوای 1987، دیکتاتۆری عێراق و دارودەســتەکەی قۆناغێکی مەترسیدارتری لە جینۆساید دەستپێکرد، لەژێر نــاوی (ئەنفالەکان)، دیارە ئەوەش هەر لە خۆڕا نەبووە و پێشــتر بەرنامەیەکی بەروەختی بۆ داڕشتووە و بڕیاری

بـۆ دەرکردووە، ئەوەتا لە 1987/3/29 بەناو مەجلسـی قیادەی سەورە مافي ئەنفال کردن و ویرانکردنی شارەکانی کوردســتان لە رووی عەســکەری و ئەمنی و مەدەنییەوە بە "عەلی حەســەن ئەلمەجید"ی ناسراو بە عەلی کیمیاوی یا عەلی ئەنفال دەدا و بەڕادەیەک کە عەلی ئەنفال ڕێگای پێدراوە هەموو ئەو یاسایانە رابگرێت کە لەگەڵ ناوەڕۆکی بڕیــاری ناوبراودا، ناکۆک بــن (بۆ دەقی بڕیارەکە بڕوانە پاشبەند).

بەرنامــەی ئەنفالکردن بە چــوار قۆناغ دانرا، کە ئەنفالی یــەک و دوو و ســێ و خاتیمــەی ئەنفالــەکان بوو، کە لە رووی جوگرافییەوە هەموو کوردستانی گرتەوە و بریتی بــوو لە تێکدان و ویرانکردنــی گوند و دێهاتەکان و تالان و بڕۆ و راگواســتن و ئەتککردنی شــەڕەف و کوشتن و لەنێوبردنی بە کۆمەڵی خەلکەکەی.

ســەرەنجامی هەر چوار ئەنفال کە لە 1987 تا 1989 درێژەی هەبوو، بووە هۆی خاپوورکردنی 1276 گوند لە کۆی 3839 گوند و شارۆچکە لە 1968ـەوە[23].

بــە گوێرەی ژمــارەی دانیشــتووانی ئــەو گوندانەیش، ئەوانەی کە بەپێی بەرنامەیەکی رێکخراوەوە ئیبادەکراون دەگەنــە زیاتــر لە (180) هــەزار کەس، بــەو رەنگە ئەو ئیبادەیەی کە لە شــێوەی ئەنفالــدا ئەنجامدرا مەگەر هەر نازییەکان یاخود ســربەکان دەرهەق بە بۆسنییەکان بەو

بەرنامەڕێژیی و نەخشەسازییە ئەنجامیان دابێت، هەر بۆ نموونە یــەک لەو نامانە کە دوای راپەڕین دۆزراونەتەوە و (نهێنــی و تایبەتــی) بە ســەرەوەیە و لە دەســەڵاتێکی بەرزەوە دەرچووە، لە وەسفي (هێرشی ئەنفالی نموونەیی و قارەمانانــە) دا نووســراوە کــە 2532 کەس و 1869 خێــزان گیــران و بــۆ ئۆردوگایــەک نێــردران[24]. وەک تەئکیدکردنەوەیەکیــش لە ژمــارەی 182 هەزار: لە کاتی دانوســتانی وەفدی بەرەی کوردســتانی لە گەڵ سەرانی رژێــم، لــە بەهاری 1991 دا، لەو کاتــەی کە وەفدەکە لە چارەنووســی ئەو ژمارەیەی کۆڵیوەتەوە 'عەلی حەسەن ئەلمەجیــد' کە ئامــادەی دانیشــتنەکە بــووە گوتوویەتی ژمارەکــە لــە (100) هەزار تێناپەڕێ! کــە دوژمن دان بە 100 هــەزار بنێت مانای وایە 182 هەزارەکە ڕاســتە و جگە لەوەش لیستی ناوی (15-17) هەزار ئەنفالکراو لەو ژمارەیەی لای ســەرەوە لەلای مســتەر (دێر شتوئیل)ی بڕیاردەری تایبەتی مافي مرۆڤ لە عێراقدا هەیە و لەسەر ئەوە بەڕێزیان ئیبادەکردنی ئەو ژمارەیە (182 هەزار) بە دوور نابینێ و پێی وایە خەملاندنێکی واقعییە[25].

ســەرەڕای ئەوەیــش، ســەبارەت بەوانــەی گیــراو و بەندکراون، عەلی حەســەن ئەلمەجید لە 1989/1/26 دا لەگەڵ کۆمەڵێک فەرماندەی عەسکەری و ئیستخباراتی و حیزبی کۆبووەتەوە، کە لەســەر کاســێتێک تۆمار کراوە،

تێیدا دەربارەی ئەو خەڵکە بێ گوناهانە گوتوویەتی:
بایەخ پێدانیان مانای شاردنەوەیانە بە شۆڤل، وشەی بایەخ پێدانیان ئەوە دەگەیەنێ ئەو کەسانە خۆیان تەسلیم کردووە، ئایا ئەوە مانای ئەوەیە کە لەسەرمە بە زیندوویەتی بیانهێڵمەوە؟ ئەو خەڵکە لە کوێ دابنێم، زۆرن؟ بۆیە بەسەر کەرتەکانم (مقاطعات) دابەشکردن و لەوێدا وامکرد کە شۆڤڵەکان بە بێ وەستان بێن و بچن[26].

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دیاریکردنی ئەنفالکراوەکان بە 182 هەزار ئەگەر زیاتریش نەبوو بێت، ئەوا بێشک لەوە کەمتر نەبووە؟!..

هەر بۆ نموونە: ئەنفالی دەڤەری بادینان دەهێنینەوە یاد، کە لە 1988/8/25دا دەستی پێکرد، واتە دوای پێنج رۆژ تێپەڕین بەسەر وەستانی شەڕی عێراق – ئێران دا و رژێم ئەو هێزانەی کە لە بەرەی شەڕی ئێراندا بوون گواستنیەوە و بەگژ خەڵکی ئەم دەڤەرەی وەنا، کە پێکهاتبوو لە دوو فەیلەق و دەیان هەزار جاش و دەبابە و زرێپۆش و جۆرەها چەکی سووک و قورسی زەمینی و ئاسمانی و گازی کیمیایی و ..... هتد.

لەو هێرشانەدا دەیان گوند وەبەر شاڵاوی چەکی کیمیاوی کەوتن (بڕوانە پاشبەند)، یەکەم گوندی کیمیا لێدراوی ئەو دەڤەرە دێی (هیس) بوو کە لە سپێدەی 1988/8/25 دا

ژەهرباران کراو دێ نشینەکان کە ژمارەیان (700) کەس دەبوو زۆربەیان هەڵاتن و ئەوەی بە سەلامەتی رزگاری بیوو بەرەو سنووری تورکیا - عێراق رەویان کردبوو و هەواڵی ژەهر بارانەکە و لەشی زامداری خۆیان نیشانی رۆژنامەنووسان دابوو.

کارەساتی گەلی بازێ لە بەرواری باڵا هەرگیز لە بیر ناچێتەوە، کاتێک کە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە نەیانتوانیبوو بەرەو سنوورەکان رەو بکەن و خۆیشیان تەسلیم بە رژێم نەکردبوو و وەک مقاومەتێک خۆیان لە ئەشکەوتەکان توند کرد بوو و لە 1988/8/29 دا لە سەعات 6،5ی سپێدە و بە ماوەدای (3) دەمژمێری بەردەوام (6) فرۆکە ژەهربارانی ئەو ئەشکەوتانەیان کرد و نزیکەی 3000 کەس لە ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە بوونە قوربانی، رژێم بەپێی بەرنامەکەی خۆی، دوای هەر هێرشێکی کیمیاوی، بەپێی توانا و دەرفەت، هێزی پیادە و زرێپۆشی وەکار دەخست بۆ ئەوانەی کە بریندار بوون و پەکیان کەوتووە، بۆ ئەوەی ئەوانیش قڕ بکات و ژێر گڵیان بکات، دیارە کە ئەمەی لە گەلی بازێ بە کارهێنا و بەوەش زیانەکان گەورەتر بوون[27].

بەو ئاوایە لە ماوەی 25 ی ئاب تا 1988/9/15 لە هەردوو پارێزگای دهۆک و موسڵ، 448 گوند وێران و خاپوور کران[28]. لەو هێرشانەدا بە هەزاران کەس ئیبادە

کران و له سەد هەزاریش زیاتر پەڕاگەندەی سنوورەکانی تورکیا و ئێران بوون و هەر لە 1988/8/30 دا (20) هەزار کەس بەرەو تورکیا ڕەویان کرد و بە دەم ئازاری نەخۆشییەکانی تیفوئید و کۆلێرا و مەلاریا و سکچوون و هەوکردنی سییەکانەوە تلاونەتەوە و بە بێ پێخەفي و بێ پۆشاکی و خواردن کە ڕۆژانە چەندین ئافرەت و منداڵیان لێ بۆتە قوربانی، ژیانیان بردووەتە سەر، بە هەر (20) کەس خێوەتێک و (2000) بەتانی بۆ (20) هەزار کەس، (8) بۆری ئاو بۆ هەمان ژمارەی خەڵک و دکتۆرێک بۆ (18) هەزار کەس، دەبێ چ ژیانێک بێت[29]؟!! چ مافێک درا بێت؟.

لە نێو خودی ئۆردوگاکاندا کە بە تەلبەند و دیواری بڵند و جەیشەوە توند کرابوو، هەر (30) مەتر چەند جەندرمەیەکی تورک وەستا بوون و دەسەڵاتی تەقەکردنیشیان لە دەرەوە و ناوەوە پێدرابوو!! دەسەڵاتی تورک تا پێی کراوە نەیهێشتووە ڕۆژنامەنووسە بیانی و ڕێکخراوە مرۆڤایەتییەکان ئاوارە و ئەنفالکراوەکان ببینن، ئەمەش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان پاراستنی بەرژەوەندی خۆی لە گەڵ ڕژێمی عێراقدا کە لێدانی کیمیایی لە سەر ئیسپات نەبێت بە تایبەتیش کە هەردوو ڕژێم لەسەر قڕکردنی کورد کۆکن، دووەم: بۆ ئەوەی ئەم پەڕاگەندانە لە ڕووی یاساییەوە وەک (پەنابەر) حیسابیان بۆ

نەکرێت[30]. لەوەشدا ئەم هەڵوێستە نامرۆڤانەیەی تورکیا ژێر پێ خستنێکی ئاشکرای جاڕنامەی مافی مرۆڤ و گشت بڕوانامە نێودەوڵەتییە پەیوەستەکانە، نەمازە پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان (1966/12/16) و رێککەوتننامەی بەرگرتن لە تاوانی جینۆساید و سزادان لەسەر ئەنجامدانی (1948/12/9) و رێککەوتننامەی دژ بە ئەشکەنجەدان و جۆرەکانی دیکەی مامەڵەکردن یا سزادانی توند یان نامرۆڤانە یاخود ئابڕووبەر (1984/12/10) و جاڕنامەی مافەکانی منداڵ (1959/11/20) و جاڕنامەی تایبەت بە پاراستنی ئافرەت و منداڵ لە حاڵەتە نائاساییەکان و ناکۆکییە چەکدارییەکان کە بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 3318 (د – 29) لە 1974/12/14 دەرچووە ... هتد..

**شەشەم :**

**گۆڕی بە کۆمەڵ، وەک بەڵگە و ئاکام:**

ئەو گۆڕە بە کۆمەڵانەی کە سەرتاسەری کوردستانیان گرتۆتەوە و هێندێکیان لە دوای راپەڕینی 1991 دا دۆزرانەوە و بڕێکی زۆریشیان تا هەنووکە ونن، بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر و سەلمێنەری جینۆسایدن، جگە لەوەی کە بەرەنجامێکی میتۆد و شێوازەکانی رەشە کوژیشە کە رژێم بۆ سڕینەوەی بوون و ناسنامە و کیانی

کورد گرتبووه بەر.

نموونــەی ئەو گۆڕە بە کۆمەڵانە لە شــاری ســلێمانیدا کۆمەڵێــک گــۆڕی بە کۆمــەڵ دیترانەوە کە یــەک لە وانە 450 تەرم و یەکێکی تریان پاشــماوەی تەرمی 370 ژن و منداڵ و پیاوی تێدا بووە.

لە شاری دهۆکیشدا چەند گۆڕێکی بە کۆمەڵ دۆزرانەوە کــە کەوتبوونــە رێــگای دهــۆک – موســڵ و کۆمەڵێــک خانــەوادەی تێــدا بوون کــە هەموویان پێکــەوە ژێر گڵ کراون. لە شاری (موسڵ)، کە گرتووخانەی بادوشی لێیە. لــە کاتــی ئەنفالەکاندا لە 1987 تــا 1989، ئەو وەختەی کە بە ســەدان و هەزاران کوردی دانیشــتووانی موســڵ لە عەشــیرەتی شــەبەک و گەرگەر و عەشایەرســەبعە و هیتر وەبەر شاڵاوی راونان و راگوێزان و ئیبادە کەوتن، گۆڕێکــی بە کۆمەڵ لــە دووری (4) کیلۆمەتر لە شــاری موســڵ دیترایــەوە کە ئێســک و پروســک و تەرمی 70 کەسی تێدا بووە.

بە گوێرەی شــاری هەولێر، چەند گۆڕێکی پێکەوەیی لە نزیــک رێگای هەولێر – کەرکووک بینرایەوە کە بە دەیان تەرمی تێدا بووە، هەروەها لە قەزای شــەقڵاوەی سەر بە هەولێر تەرم و ئێســک و پروســکی (23) کەس ئاشــکرا کراو لەســەر رێگای هەولێر – موســڵ و لەســەربازگەی هەولێر و رەشکین و نزیک مەخمووردا، لە دوای راپەڕینی

1991 کۆمەڵێک گۆڕ دۆزراونەتەوە کە یەکێکیان تەرم و ئێسـک و پروسـکی 1500 کەس و یەکێکی تر هی 100 کەسی لێ دەرهێنراوە و ئێدیش ماون.

لە شـاری کەرکووکدا لە نزیک لەیلان گۆڕی بە کۆمەڵ دۆزراونەتـەوە کـە بەدەیان تەرمی تێدا بـووە، هەروەها ئـەو گۆڕانەی نێزیـک گەڕەکەکانی (الحریـە) و (القدس)، جگـە لـەو گۆڕە بە کۆمەلانەی سـەر رێـگای کەرکووک – سـلێمانی کە بە سـەدان تەرمیان تێـدا دۆزرایەوە، کە هێندێکیـان هی ماوەی دوای ئەنفالـەکان و بڕێکی تریان هی دوای راپەڕینی 1991 بووە کە بە هۆی تۆپ و تانک و زرێپۆش و هێلیکۆپتەری رژێمەوە لە کاتی رەوی چەند ملیۆنیدا ئێبادە و رەشەکوژ کراون، کە هێندێکیان هەروایی بـێ کفـن و دفن ماونەتـەوە، ئەمەش لەبـەر گەورەیی و ترسناکی کۆچڕەوەکە و بێ نان و ئاوی، منداڵ و نەخۆش و پەککەوتە و تەمەندارەکان لە (بێ هێز و بڕسـتەکان) لە رێگادا دەمانەوە[31].

## پشکی دووهەم:
## ئەشکەنجەدانی جەستەیی یان رۆحی و سایکۆلۆژی

گرتنەبـەری رێـگای ئازاردانـی لەشـی و رۆحـی لـە لایـەن رژێمەوە، بە مانای جینۆسـاید کردنی بەشـێنەیی و لەسـەرەجۆی کـوردە لەروانگـەی جیـا ڕەگـەزی و نیشـتمانپەروەرییەوە، دەسـتدرێژی و سـووکایەتی کردنـە بە کەرامەتی مرۆڤایەتـی، ئەمەش تاوانێکە خودی رێککەوتننامـەی قەدەغەکردنـی جینۆسـاید تەجریمـی کـردووە و لە هەمان کاتدا پێچەوانە و سـەرپێچی و ژێر پێ خستنی ئەم بڕوانامە یاساییانەی خوارەوەیە:

(1) دەستووری کاتی عێراقی (1970/7/16) کە بەندی بیسـت و دووهەم (ء) وا دەقنووس کراوە: شـکۆمەندیی مـرۆڤ پارێـزراوە و مومارەسـەکردنی هـەر جۆرێـک لـە جۆرەکانـی ئەشـکەنجەدانی جەسـتەیی و دەروونی

قەدەغەیە.

(2) یاسای سزادانی عێراقی (ژمارە 111ی ساڵی 1969 هەموارکــراو) لــەم چەند بەندانەی خــوارەوە ئاماژەی بە مەسەلەی ئەشکەنجەدان کردووە:

(ء) بەندی 323: هەر کارمەندێک یا (راژەی گشــتی پێ ســپێردراوێک) بە گرتن ســزا دەدرێ ئەگەر سزای دا، یا فەرمانی دا بە ســزایەکی توندتری مەحکووم کراو لەوەی کــە بەپێی یاســا بۆی دانــراوە، یان بە ســزایەک کە پێی حوکــم نەدراوە، لە گەڵ پێزانینیشــی لەوەی کە کارەکەی سەرپێچی یاسایە.

(ب) بەندی 324: هەر کارمەندێک یا راژەی گشــتی پێ ســپێردراوێک بــە گرتن ســزا دەدرێ ئەگەر ئیــدارە یان پاســەوانێتی گرتووخانە و بەندیخانە یان دامەزراوەکانی تری تایبەت بە جێبەجێکردنی سزا یان تەدبیری ئیحترازی پێ ســپێردرا بوو و بەپێی فەرمانی دەسەڵاتی تایبەتمەند کەســێکی وەرگرت، یاخود فەرمانێکی کە بۆ بەرەڵاکردنی زیندانییەک دەرچووە، جێبەجێی نەکرد یان ... هتد...

(ج) هەر کارمەندێک یا راژەی گشــتی پێ سپێردراوێک بە گرتن یا زیندانیکردن ســزا دەدرێ ئەگەر ئەشکەنجەی دا، یــا فەرمانی دا بە ئەشــکەنجەدانی تاوان دراوە پاڵ یا شــاهیدێک یاخود خەبیر و شــارەزایەک بۆ ناچارکردنی لەســەر داننان بە تاوانێــک.........، و بە کارهێنانی هێز یا

گەڤ و هەڕەشە، لە حوکمی ئەشکەنجەدان دایە.
(3) یاسـای چۆنیەتی دادگاییکردنی سزایی ژمارە (23) سـالی 1971 ی هەموارکراو لـە بەندی 127 یدا دەلێت: نابێـت وەسـیلەی نـاڕەوا بەکاربهێنرێت بـۆ کارتێکردن لەسـەر تاوان دراوە پاڵ بـۆ ئیعتراف لێوەرگرتنی، خراپ مامەلەکـردن و گەڤکـردن بە ئەزیەتـدان و ئیغراکردن و بەلێنـدان و هەڕەشـەکردن و کارتێکردنـی سـایکۆلۆژی و بەکارهێنانـی داو و دەرمانـە لە هـۆش خۆ بەرەکان و سەرخۆش کارەکان، بەوەسیلەی ناڕەوا دەژمێررێن.
(4) جاڕنامـەی جیهانی مافي مرۆڤ (1948) لە بەندی پێنجەمیدا جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە (هیچ مرۆڤێک ئەشـکەنجە و سـزا نادرێـت و رەفتاری تونـد و تیژی و درندانە و ئابڕووبەری لەگەلدا ناکرێت).
(5) پەیمانـی نێودەولەتیـی تایبـەت بە مافـە مەدەنی و سیاسـییەکان، لە بەندی (7) یدا وا هاتووە کە "نابێت هیچ کەسـێک بخرێتە ژێر ئەشـکەنجەدان یا سـزایەک یاخود مامەلەیەکـی رەق و تونـد یـا نامرۆڤانە یـان ئابڕووبەر لەگەلدا بکرێت".
(6) جاڕنامـەی پاراسـتنی هەمـوو کـەس لە تووشـی ئازاردان و جۆرەکانی مامەلەکردن یان سزای توندوتیژ یا نامرۆڤانە یاخود ئابڕووبەر " کە بە بڕیاری کۆمەلەی گشتی ژمارە 3452 (د – س) لە 1975/12/9 دا دەرچووە، لە

بەنـدی (2) دا دەڵێ: (هەر کارێک لـە کارەکانی ئازاردان یا هیتر لە جۆرەکانی مامەڵەکردن یان سزای توند یاخود نامرۆڤانە یا ئابڕووبەر، سووکایەتی کردنە بە شکۆمەندی مرۆڤایەتی، بەو وەسـپەی کـە نکۆڵیکردنی ئارمانجەکانی بڕوانامـەی نەتـەوە یەکگرتووەکانـە و پێشـێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانە کە لە جاڕنامەی جیهانی مافي مرۆڤدا دەقنووسکراوە، مەحکووم دەکرێت، هەروەها بەندی (3)ی هەمان جاڕنامە دبێژێت "نابێت هیچ دەوڵەتێک ڕێگا بە ئەشکەنجەدان بدات، یا جۆرەکانی تری مامەڵەکردن یاخود سزای توند یا نامرۆڤانە یا ئابڕووبەر، یاخـود چـاوی لێبپۆشـێت و ڕێـگا بـە وەرگرتنـی بارە نائاسـاییەکان نادرێت، وەک باری شـەڕ یـا خەتەرناکیی شـەڕ، یاخود نائارامی سیاسی ناوەخۆ، یا هەر حاڵەتێکی نائاسـایی گشـتی دیکە، کـە وەک بڕوبیانوویەک بێت بۆ پاسـاوی ئازاردان یا جۆرەکانی تری مامەڵە یان سـزای توندوتیژ یا هۆڤیانە یاخود ئابڕووبەر.

(7) ڕێککەوتننامەی دژ بە ئەشـکەنجەدان و جۆرەکانی تری هەڵسـوکەوتکردن، یا سـزای توند یاخود نامرۆڤانە یـان ئابڕووبەر (کە بە بڕیاری کۆمەڵەی گشـتی 46/39 لـە 1984/12/10 دا دەرچـووە و لـە 1987/6/26 دا کاری پێکـراوە" هەر بۆ نموونە لە بەندی (2/2)دا دەڵێت: نابێـت بڕوبیانوو بۆ بارە نائاسـاییەکان بهێنرێتەوە، هەر

چۆنێک بووبێت، ئەگەر ئەو باروزروفە حالەتی شەڕ بێت یان گەڤ و هەڕەشـەی جەنگ یاخود نائارامی سیاسـیی ناوەخـۆ یا هەر حالەتێک لە بارەکانی نائاسـایی گشـتیی دیکە، وەک پاسـاوێک بۆ ئەشکەنجەدان. هەروەها (3/2) ی هەمان ڕێککەوتننامە دەڵێت: نابێت بڕو و بیانوو بە ئەو فەرمانانـەی کە لـە کارمەندانی بـالاوە دەرچوون یان لە دەسەلاتی گشتییەوە، وەک پاساودانێک بۆ ئەشکەنجەدان بهێنرێنەوە.. هتد .

(8) بنەما نموونەییەکانی لانی کەمی مامەڵەکردن لەگەڵ زیندانییـەکان کە لـە 1977/5/13 دا دەرچووە لە خاڵی (31)یدا دەڵێ: سـزای جەسـتەیی و سـزای لـە زیندانی تاریک ئاخنین، و هەر سـزایەکی توند و بێ ویژدانانە، یا نامرۆڤانە یاخود ئابڕووبەرانە، وەک سزایەکی تەئدیبی بە تەواوی قەدەغەیە، (1/32) لە هەمان بنەما نموونەییەکان دەڵێـت: نابێت لە هیـچ کاتێکدا زیندانی بە گرتنی ئینفرادی سـزا بدرێت یاخود بە کەمکردنەوەی ئـەو خۆراکەی کە دەیدرێتێ تەنها پاش ئەوەی کە پزیشک تەماشای کردووە و بە نووسین شایەدی ئەوەی دا کە زیندانییەکە بەرگەی سزای لەو بابەتە دەگرێ.

سـەرەڕای هەبوونی گشـت ئەو بڕوانامـە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییانـەی کە ئەشـکەنجەدانی لەشـیی و ڕۆحیان قەدەغە کردووە، کەچی ڕژێمی دیکتاتۆر بە تاسـەوەبوو

بۆ سڕینەوەی ناسنامەی کورد و بیر و باوەڕی نەتەوەیی وای لێکردووە کە دانانی یاسا و بڕوایی دان بە بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان وەک "خەت خەتۆکانێیەکی کاتی بێزاری خۆی دابنێ"[32] و بە نوێژی نیوەڕۆ نەک هەر سەرپێچییان لێبکات بەڵکو بە بەربڵاوی داهێنانیش لە شێوازەکانی ئەشکەنجەدان بکات.

وەک ئاشکرایە، ڕژێمی بەعس ئەو جۆرەها ئەشکەنجە و ئازاردانی جەستەیی و ڕۆحی، هەروەها گرتن و گلدانەوە و بەندکردن و تەوقیفکردن کە ئەنجامی دەدان نایاسایی و هەروا لە گۆترە و ڕەمەکیانە بوون، ئەوانەی کە دەگیران بێ تەحقیق و توێژینەوە، بێ دادگایی کردن یا داکۆکی لە خۆ کردن و ڕێککەوتن لەگەڵ پارێزەرێک، لە سێدارەدان و لە زیندانەکان توند دەکران، یا ئەوەتا لە ڕێگای دادگایێکی کورت پاشکلیدا، یان بە بێ ئیزنی دەسەڵاتی دادوەری دەگیران، دیارە کە دەسەڵاتی تەنفیزی و جێبەجێکردنیش (بەدەر لە تاوانە ئاساییەکان)، دامودەزگاکانی حزبی بەعس بوون کە بریتی بوون لە ئەمنی عامە و خاصە و ئیستخبارات و پۆلیس و ... هتد. بەو شێوەیە وەک هەندێک رایان وایە کە گرتووخانە هەمەچەشنەکانی عێراق لە "250" هەزار کەسی بە تۆمەتی سیاسەت، کەمتر تێدا نەبێت و دیارە کە بە تەبیعەت بەهری کورد تێیدا زۆرە[33].

ئەوانەی کە لە سێدارەدەدران، لە پێشدا ئازار و ئەشکەنجە دراون، بەڵگەی ئەمەش شـوێنەواری ئەشـکەنجەکانە بە سـەر لاشەکانەوە، وەک بڕین و سـووتان و لووت بڕین و نینـۆک راکێشـان و چـاو دەرهێنـان و .. هتد. ئەمەش ئەو کاتە ئاشکرا بووە کە تەرمەکانیان بۆ خانەوادەکانیان گێڕاوەتەوە و سەرباری ئەوە (وەک شەڕێکی دەروونی)، هەر تەرمەی "300" دیناریان لێ سـەندوون (لە بەرامبەر ماندووبوونی لە سـێدارەدانکردنیان و گوللەی کوشتن و گواستنەوەیان) دا.

ئـەوە لـە کاتێکدا کـە جاڕنامەی جیهانـی مافی مرۆڤ لـە بەندی (9) یـدا تەئکید لەوە دەکاتەوە کـە نابێت هیچ مرۆڤێک بە شێوەیەکی رەمەکی بگیرێت و دەست بەسەر بکرێت یا دوور بخرێتەوە کەچی بە دەیان هەزار کەس لە زیندانەکان و شوێنەکانی موخابەرات و ئەمن توند کراون و بێ دادگایی، ئازار دراون.

بە رەمەکی گرتنی خەڵک لە شـوێنە گشـتییەکانی وەک "بـازاڕ و دامودەزگاکانـی دەوڵەت و شـوێنی ئیشـکردن و لـە کووچـە و کۆڵانەکاندا ئازارێکی نەفسـی و رۆحی کاریگەریشـی بۆ خانەوادەی ئەو خەڵک گیراوە دروست دەکرد، چونکە شـوێنەون و بـێ چارەنووس دەمانەوە و رژێـم ئـەو خێزانانەی لە گرتنی خـزم و خوێش و کەس و کاریـان ئـاگادار نەدەکـردەوە لە وەختێکـدا بنەماکانی

لانــی کەمــی هەڵســوکەوت کــردن لەگــەڵ زیندانییــان 1977/5/13، لــە بەندی (92) یدا ڕێگای بە تاوان دراوە پــاڵ داوە زووبــەزوو خێزانەکــەی لە گرتنەکــەی خۆی، ئاگادار بکاتەوە، بۆ ئەوەش بنەمای ناوبراو، داوای هەموو ئاســانکارییەکی شــیاو دەکات کە بۆی بکرێت بۆ ئەوەی ئەو کەســە پەیوەنــدی بە خێــزان و هاوەڵەکانی خۆیەوە بکات و دیدار و پێشوازیشیان لێبکات..

بەڵام بە پێچەوانەی ئەو بنەمایەی لای سەرەوە، خێزان و کــەس و کاری گیــراوەکان نەیــان دەوێــرا لــە کــوڕو منداڵەکانیــان بپێچنەوە. لە ترســی ئەوەی نەبادا ئاشــکرا ببن و خەڵکی دیکەشیان لێ شوێنە ون و زیندانی بکرێت. لــە حاڵێکیشــدا ئەگــەر لێرە و لــەوێ ˚ بە هــەر هۆیەکی واســیتەکاری و بەرتیــل و پــارەوە بــۆ پیاوانــی ڕژێــم پرسیارکردن و بەدواداچوونێک هەبوایە ئەوا داروودەستەی ڕژێــم یا نکۆڵییان لێدەکرد، یاخــود تەنها هەواڵی گرتنیان ئاشــکرا دەکرد بێ دەستنیشانکردنی شوێنی گرتنەکە بەو شــێوەیە شــەڕی نەفســی لەگەڵ ئەم خانەوادانە دەکرا و باری دەروونییان بەرەو داتەپین و داڕمان دەچوو[34].

ئــەو شــێوازانەی کە ڕژێــم لــە ئەشــکەنجەداندا وەک ڕێگایەکــی ئیبادەکــردن بەکاری دەهێنا لــە مێژوودا کەم وێنەیــە و زۆر لــە زیندانییــەکان لە ژێر بــاری تەعزیبدا گیانیان لەدەستداوە، نموونەی ئەم شێوازانەش، کونکردنی

دەســت و پێ بە بزمار یا بە دڕێلی کارەبایی و شــکاندنی لــووت و پەنجە بە چەکووشــی ئاســن، لەتکردنی دەم و زمــان، پڕکردنی ســییەکان لە ئاوی گەرم، دەســت و پێ بڕین بە مشاری کارەبایی، بەرزکردنەوەی پلەی گەرمای ژووری زینــدان بــۆ (50) پلەی ســەدی لــە هاویندا، جێ هێشــتنی تەرمی زیندانییە لە ســێدارەدانکراوەکان لە نێو هاوەڵەکانیــدا بۆ چاندنی ترس و لــەرز و بڵاوکردنەوەی نەخۆشی، دەستدرێژی کردنە سەر ژن و دایک و خوشکی زیندانــی و رووت کردنەوەیان لەبەر چــاوی زیندانییەکە کــە وەک وەســیلەیەکی ئیعتراف پێکردن بــە کاردەهات، تواندنەوەی زیندانیی لەنێو تێزابدا، خەساندن، لەنگەو قۆچ هەڵواسینی ئافرەتی بێ نوێژ. (بڕوانە پاشبەند)[35] .

بــەو رەنگە، بوون و کەرامەتی ئینســانی کورد، لەلایەن رژێمەوە بە جۆرێک ســووکایەتی پێکراوە و هەڕەشــەی لێکراوە و ژێر پێ خراوە، کە زۆر جار ئەگەر زیندانییەکان لە ژێر فشاری ئەشکەنجەداندا گیانیان لە دەست نەدابێت، ئەوا دانیان بەو تاوانەدا ناوە کە دارودەستەی رژێم بۆیان هەڵبەستووە و ئەو کۆنووس (محضر)ە یان ئیمزا کردووە کە ئەوان پێشتر ئیملایان کرد بوو.

یەکێــک لــەو ئارمانجــە گڵاوانــەی دیکــە ئیبادەکردنی لەســەرەخۆ کــە رژێــم لــە رێــگای ئازاردانی لەشــی و دەروونــی بە کۆمەڵــەوە دەیکرد، چاندنی تــرس و لەرز

و دڵەڕاوکێ بوو لە دڵی ئەو خەڵکانەی کە لە گوند و دێهاتەکاندا دەژیان، ئەوەش بۆ خەساندنی رۆح و بیروباوەڕیان بوو، بۆ گۆڕینیان بوو بە (رۆبۆت)، ئەو حاڵەتەش زێتر لە ماوەی دوای 1975 دا بەرجەستە بوو، کاتێک رژێم لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول (1961)، بێجگە لەو ئەمنانەی کە لە بەرگی پۆلیسدا خۆیان دەنواند، ناوچە و گوندەکانی پڕ کردبوو لە ئەمن و موخابەرات و ئیستخبارات و سووپا، کە رۆژانە و هەر جارەی لە ژێر پەردەی بڕوبیانوویەکەوە و بۆ تۆقاندن ژمارەیەکی زۆر لەو پیاوانەی رژێم، بە چەکەوە و لە کاتی ناوەختی وەک نیوەشەو یا کاتی بانگی بەیانیان، بە بێ ئیزن بە ماڵەکان وەردەبوون و حورمەتی ماڵەکانیان دەشکاند و هەموو شتێکیان دەپشکنی، کە ئەوە بەر لە هەر یاساو رێککەوتننامەیەک پێچەوانەی دەستووری کاتی عێراقییە کە لە بەندی (22/حـ) دا دەڵێ: (ماڵ حورمەتی خۆی هەیە، چوونە ژوورەوەیان پشکنین نابێت، تەنها بەپێی ئەو بنەمایانەی کە لە یاسادا دیاری کراون)، زۆر جار لە کاتی پشکنیندا و لە ژێرەوە چەند گوللەیەکیان خستۆتە نێو کەلوپەلی چەند ماڵێکەوە و لە پاشدا بەوە تاوانباریان کردوون کە چەکیان هەبووە و پەیوەندیان بە (شاخ و پێشمەرگە) وە هەیە و بەپێی ئەوە دەیانبردن و دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر یا لە سێدارەدان یاخود زیندانی تا

هەتا یا ئەوەتا شوێن بزریان دەکردن..
حاڵەتی تر کە هەر لە دێهاتەکاندا ئەنجامیان دەدا، ئەوە بوو کە ناوەناوە چەند کەسێکیان لە خەڵکی گوندێک دەکوشت و تەرمەکەشیان لە گوێ رووبار یا نێو باخچەی خەڵک، یا شەقام و کۆڵانەکان فڕێ دەدا، ئەمەش بە مەبەستی تۆقاندن و ئـازاردان لە هەمان کاتـدا تێوەگلاندن و تاوانبارکردنی خەڵکی گوندەکە بە کوشتنی یا ئەوەتا مەشق و راهێنان و خۆنیشاندانی سـەربازییان لە نێو گونددا دەکرد، ئەوەش وەک دیـارە لە پـاڵ ئەوەی بۆ سـەرکوتکردن و چاندنی تـرس و تۆقاندن بووە، بۆ لەقکردن و لاوازکردنی بڕوا و ئیرادەی خەڵکەکەش بووە بە کێشـەی میللەت و بەو ئوێل و عەقیدەیەی کە لە سەرین[36] ..
(تەیمـور عەبدوڵـڵا) لە 1988 دا تەمەن 12 سـاڵ، کە خەڵکـی گوندی کولەجۆی سـەر بە شـاری سـلێمانییە، شاهێد و دەربڕی حەقیقەتی تاڵ و مەشهەدێکی ئەنفالەکانە و خـۆی هەمـوو ئازار و ئەشـکەنجەدانێک و لە پاشـان ئیبادەکردنـی خەڵکانێکی زۆری بینیوە و دایک و باوک و سـێ خوشک و سـێ پووری لە هەمان وەجبەدا بوونەتە قوربانی و تەنها خۆی رزگاری بووە!!.
تەیمـور لـە گفتوگۆیەکـدا بـە وردی پەردە لـە رووی هەمەجیـەت و وەحشـیگەریی رژێمـی هەڵماڵـی، بەوەی جاشـەکان لە چوارچێوەی هێرشێکی بەرفرە و بەربڵاوی

ئەنفالەکانــدا دەوری گوندەکەی تەیمــور و دەوروبەریان داوە و کۆیان کردوونەتەوە و بە درۆ پێیان راگەیاندوون کــە بــەرەو (کــەلار) یــان دەبــەن کەچــی بــەرەو قەڵای ســەربازیی (قۆرەتو)یــان راپێــچ کردوون کــە دە رۆژی مەمــرە و مەژی لەوێ ماونەتەوە (دیارە ئەو قەڵایە وەک بنکەیەکــی گواســتنەوە و لێــک هاوێردنــی ئەو کەســانە بــووە کە ئیبادە دەکرێن)، دوای ئەو ماوەیە لە 30 تا 40 سەیارەی بارهەڵگری ئیڤاوە ئاخنراون، بۆ گواستنەوەیان بۆ زیندانخانەی تۆبزاوە لە باکووری کەرکووکدا، ژوورە گەرمەکانــی ئەم گرتووخانەیە لەو منداڵ و ئافرەت و پیر و پەککەوتانە تــژی کراون و ماوەی مانگێک بۆ تەپاندنی مەعنەویــات و ئازاردانــی لەشــی و رۆحــی و دەروونی، بــە مەبەســتی ئامادەکردنیــان بــۆ قەتــڵ و عــام، لەوێ هێشــتوویانەتەوە و لــە پلەیەکی گەرمای بــەرزدا، پیاو و ژن و منداڵیان لێک جیا کردۆتەوە.

پیاوەکانیان بە دەرپێی ژێرەوە هێشتۆتەوە و دەستەکانیان بەســتوونەتەوە و لە یــەک ریزی درێژدا بــە یەکەوەیان بەستوونەتەوە و لە سەیارەی تری جۆری ئیڤایان ئاخنیون بــۆ کوشــتن، ژن و منداڵەکانیشــیان (10) دە رۆژ دوای پیاوەکان هێشــتۆتەوە و رۆژانە تەنها پارچە سەمونێکیان هەبووە و دوای ئەو ماوەیە بە سەیارەی داخراوی رەنگ ســپی(گرتووخانەی گەڕۆک) لە (6) ی سپێدەوە بۆ سەر

سـنووری سعودیه براون و شـەو گەیشتوونەتە شوێنی ئیبادەکردنەکە و لەو ماوەیەدا (6 ی بەیانی تا نزیک شەو (ئازار و ئەشکەنجەیێک دراون، کە قەڵەم هەرگیز ناتوانێت گوزارشتی لێبکات)!! .

ئەوەی کرا، لە مانگی رەمەزانی پیرۆز لای موسـڵمانان و لـە مانگـی ئابی هەڵاو گرتـوودا بوو کە لـە نێو چەند زیندانێکی ئاسنینی گەرۆکی سوورەوەبوودا کە هەردوولا دەرگەی داخراو و تەنها پەنجەرەیەکی بچکۆڵەی هەبووە، ئاپۆرە و حەشـاماتی منداڵی نیـوە رۆح و مردوو و ژنی سـەر و پرچ و سـنگ و روومەت داڕنـاو و دادڕاوە، بێ ئاوو بێ نان و هەوای ئۆکسجینیش نوزە لێ بڕاو.

بـە هـەر حـاڵ چ ئەوانـە کـە دەگەیەنرێنـە شـوێنی چاڵەکان لە بیابانی نزیک سـعودیە دا، بە شـێوەیەک بێ هێـز و توانـا و نیوە مـردوو دەبن، کاتێـک کە جەیش و موخابەرات و حەرەس سەدامییەکان، دەیانخەنە نێو چاڵە بـە کۆمەڵەکانەوە، بێ دژایەتیکـردن، بێ هاوار و قیژە یا جـۆرە رەفز و رووبەڕووبونەوەیەک یـا هوتاف لێدانێک کـە وەک عادەت لە سـەرەمەرگدا دەکرێـن و دەگوترێن، دوای ئـەوەی چـاوی هەموویـان دەبەسـتن (دیـارە کە تەیمـور لە ژێـرەوە توانیویەتـی چاڵەکان ببینـێ) دەچنە ژێر باری ئیبادە و رەشـەکوژییەوە و بە کۆمەڵ شـەهید دەکرێـن، وەلێ، تەیمور دوای دووجار بریندار بوون هەر

دەمێنێ و لە کاتی هاتوچۆی شـــۆڤڵەکان، ئەو بە دەرفەتی دەبینێ و چاوەکانی بۆ دواجار لە لاشـــەی هێشتا گەرمی دایک و هەرســـێک خوشکەکانی (گێلاس و لەیلا و سروە) و هـــەر ســـێ پوورەکانـــی هەڵدەنگوێ و لە پاشـــدا خۆی دەخاتە چاڵێکی تری نزیکەوە و هەر چۆنێک بێت رزگاری دەبێت و دەبێتە شـــاهیدێکی راستگۆ و راستەقانی ئازار و ئەشکەنجەدانی هەزاران ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتەی کورد[37] ..

## پشکی سێیەم :
## هێنانە ژێر باری کۆمەڵی کورد بە دەستی ئەنقەست بۆ هەلومەرجێکی ئەوتۆ کە ئاکامەکەی تێک شکاندنێکی ماددیانەی گشتگیری یا بەشگریی بێت.

دیــارە کە رژێم بۆ جینۆســایدکردنی کــورد، هەر تەنها رێگای کوشــتن و ئەشــکەنجە و ئازاردانــی نەگرتە بەر، بەڵکو وەسـیلەی خەتەرناکـی دیکەیشـــی بەکارهێنا، بەو نیــازەی ناڕاســتەخۆ و بە شـێنەیی هەموو، یا بەشـێکی ئــەو گەلــە تارومار و پەرت و پەخشــان بــکات، بۆ ئەوە پرۆســەی چۆڵکــردن و وێرانکردنی شــار و گوندەکانی کوردســتان و کۆکردنەوەیــان لە شــوێنی تایبەتیدا و لە پاشــدا دوورخســتنەوەیان بــۆ دەرەوەی کوردســتان لە

ژێـر گوشــاری تەرهیــب و تۆقاندنــدا دەســتیپێکرد، لەو چوارچێوەیەدا راگواســتن و رەوپێکردن لە نێو سنووری عێــراق و دەرەوەیدا ئەنجامدرا و خاک و موڵک و ماڵ لە خەڵک زەوت کراو داماڵرا و زۆربەی ناوچە چۆڵکراوەکان بە ملیۆنەها مین چێنران و لە پاشــدا ســەپاندنی ئابڵۆقەی ئابــووری و پشتگوێخســتنی لانــی کەمــی دابینکردنــی گوزەرانێکی مەمرەومەژیی راگوێزراوەکان کە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی چەشنەها نەخۆشی کوشندە و گیروگرفتی کۆمەلایەتی و رەوشتی و خێزانی.

**یەکەم :**

**راگواســتن و رەوپێکردن و تێکشــکاندن لە ســنووری کوردستان و عێراق :**

**(1) تەرحیــل و تەهجیری گوند و دێهاتەکان و دیاردەی نۆردوگا زینداننییەکان،**

لــە دوای رێککەوتننامــە خیانەتکارییەکــەی جەزائیــر (1975/3/6) کــە بە نەخشــە و پیلانــی دەوڵەتە ئێقلیمی و زلهێــزەکان ئەنجامــدرا و لە پێناوی شکســت پێهێنانی شۆرشی دیفاع و مقاوەمەت لە بوونی کورد، تێیدا سەدام حســێن نرخی زۆر گەورە و گرانی دا، لەو وەختانەدا بە خەیاڵی دروست نەبوو نەوەی ئەو شۆرشە و قۆستنەوەی

هەلومەرجـی لاواز و داتەپیوی کورد، پرۆگرامێکی هەمە لایەنـەی ئیبادەکردنی داناو یەک لـەو پێنگاڤە بەراییانەی کە هەڵیهێنا، راگواسـتنی دانیشـتووانی گوندەکان بوو بۆ ناوەڕاست و باشووری عێراق ئەویش بە دوو قۆناغ:

یەکەمیـان: ئـەو کەسـایەتی و خانەوادانـەی کە دوای شکست پێهێنانی شۆڕشی مقاوەمەت، درەنگ لە ئاوارەیی و پەناهێندەیـی لە ئێران گەڕابوونەوە، هەروەها ئەوانیش کە بۆنی ئەوەیان لێدەکرا رۆڵی بەرچاویان لە شۆڕشەکەدا هەبوبێت یان بەوە گومانبار دەکران[38].

دووەمیان: راگواسـتنێکی رەشۆکی و هەمووانی بوو بە بـێ جیاوازی[39]، ئەوە بوو لـە 1976 دا و لە ژێر ناوی (نیشـتەجێ کردنەوە – اعادة التوطیـن) و بە رەزامەندی شای ئێران، نەخشەی راگواستن و چۆڵکردن و وێرانکردنی گوند و دێهاتەکانی کوردستان بە پانتایی (5–10میل) و بە درێژایی سـنووری عێراق – ئێران جێبەجێ کرا، ژمارەی ئەوانەی کە وەبەر ئەو شـالاوە کەوتن بە هۆی رەوش و باروزرووفـي نالەباری کوردسـتانەوە روون نییە، بەلام ئەوەی کە رژێم لە رۆژنامەی (الثورة)ی زمان حاڵی حیزبی بەعسـی فەرمانرەوا لە 1978 دا دانـی پێداناوە تەنها لە ماوەی (2) مانگاندا ( 150) هەزار کەس بووە[40].

هەروەهـا پیاوێکی دیکەی رژێم کە نێوی (عەبدولکەریم بەرزنجی)یە و لە هەشـتاکاندا پارێزگاری سلێمانی بووە

قســەی بۆ ئاژانسی رۆیتەر کردووە و دانی بەو ژمارەیە داناوە و بە پێی ســەرچاوەیەک گوتوویەتی لە 1975 دا (150) هــەزار کورد بۆ شــوێنە دوورەکانی باشــوور و ناوەراستی عێراق راگوێزراون[41].

لە سەرچاوەیەکی دیکەدا و بۆ هەمان بۆنە ناوبراو دانی بە راگواســتنی (300) هەزار کەســدا ناوە بۆ شوێنی تر! کە ئاژانســەکە خۆی ئەو شــوێنانەی بە دەشتی کاکی بە کاکی و وشــک و برینگ و خاڵــی لە دار و دەوەن و ژێر چاوەدێری بە هێزی پیاوانی رژێم ناوزەد کردووە[42]..

ئەوە لــە کاتێکدا جاری جیهانی مافــی مرۆڤ لە بەندی (1/13) دەڵــێ (هەموو کەســێک ئازادیــی هاتن و چوون و هەڵبژاردنی شــوێنی نیشتەجێ بوونی لە نێو سنووری هەر دەوڵەتێکدا هەیە) و لە بەندی (12) دا دەســتێوەردان لــە ژیانــی تایبەتی و خێزانیــی قەدەغە کــردووە: (نابێت ژیانــی تایبەتــی و خێزان و مــاڵ و نامەگۆڕینەوەی هیچ کەســێک بەرەمەکــی دەســتێوەردان ببێــت و ئابــڕوو و نێوبانگیشــی وەبەر پەلاماردان بکەوێت، هەموو کەسێش مافی خۆ پاراســتنی قانوونی لەو جۆرە دەستتێوەردان و پەلاماردانەدا هەیە).

هەروەها پەیمانــی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاســییەکان لە بەندی (1/12) دا دەڵێ: (هەر کەسێک کــە بە یاســایی لە نێــو ئیقلیمی دەوڵەتێک دایــە، مافی بە

ئازادی هات و چۆ و هەڵبژاردنی شـوێنی نیشتەجێبوونی هەیـە) کە ئەوەش دیـارە تەئکیدکردنەوەی هەمان بەندی 1/13ی جـاڕی جیهانییـە و بەنـدی ( 1/17 ) و (2/17) یـش لە هەمان پەیمانی ناوبـراو، جەختکردنەوەی بەندی (12) ی جارنامــەی جیهانییە، کە عێراق تێیاندا یەکێکە لە دەوڵەتە لایەنەکان و مولزەمە بە جێبەجێکردنیان.

ســەرەتا و بــەر لــەوەی کە رژێم هێرشـی راگواسـتن دەستپێبکات، شەڕی دەروونی و گیروگرفتی جۆراوجۆری ئیـداری و بژێـوی و کۆمەڵایەتـی بۆ خەڵکەکە دروسـت دەکرد بۆ ئەوەی لە ژین بێزاربن و مەسـەلەی راگواستن لە لایان ئاسـایی بێت، لەو گرفتانە وەک نەبوون و کەمی داو و دەرمان و پێداویستییەکانی نەشتەرگەری و پزیشک کــە زۆرجـار روویداوە، ئینسـانێک لەسـەر سـادەترین برین یا نەخۆشـی، گیانی لە دەسـتداوە، هەروەها بڕینی ئـاو و کارەبـا (ئەگەر کارەبا لــە ئەساسـدا هەبووبێت)، کەمکردنــەوەی هاتوچـۆی ئۆتۆمبێـل و هۆکانی دیکەی گەیانـدن و چاکنەکردنەوەی کوێرە رێگاکان بۆ ئەوەی بە تــەواوی دابـبڕێن، بە تایبەتــی لە رووی گەیاندنی خۆراک و ئازووقە و دانەوێڵەوە، جگە لە جاڕسـکردن و دەسـت درێژیکردنــی پیاوانــی جەیش و ئەمــن و موخابەرات بۆ سەر خەڵکی گوندەکان و داخستنی دەرگای مزگەوتەکان لــە غەیـرەز ئەو چەنـد دەقیقەیــەی کاتی نوێژکـردن و،

ئــەوەی رادیــۆی لە ماڵــدا هەبوایە لە ترســان دەبوا هەر ئەوەکەی (بەغدا) بکاتەوە ئەوانی تر بە تایبەتی رادیۆکانی (دەنگــی ئەمریکا و لەندەن و مۆنتــی کارلۆ و رادیۆکانی شۆڕشی مقاوەمەت) چونکە باسی هەستانەوە و بەرگری و چالاکییەکانی پێشــمەرگە و کێشــەی کوردی دەکرد و مەعنەویــات و ئیرادەی گەلەکەی پــێ بەهێز دەبوو، زۆر بــە نهێنــی دەکرانەوە و گوێ لێ گرتنیــان قەدەغە بوو و لە کاتی ئیســپات بوونی لە سەر یەکێک، سزای توندی لە سەر بوو!!

تەرحیل و تەهجیرکردنی گوندنشینەکان، ژێر پێ خستن و زەوتکردنی گەلێک مافی تریشــی بەدەمەوە بوو، لەوانە مینرێژکردنــی تــەواوی ناوچە چۆلکــراوەکان بۆ ئەوەی هیــچ هاتوچۆی تێدا نەکرێت[43]. هەروەها بە تالان بردنی مــاڵ و مومتەلەکاتــی شەخســی خەڵکەکــە بــە تایبەتی ئاژەڵی جۆراوجۆری شــیردار و بەرووبوومی کشتوکاڵی کــە ســەرچاوەی ژیانیــان بــووە، پاشــان تەقاندنەوە و خاپوورکردنی خانووەکان و کوێرکردنەوە و تێکدانی رێگاو کانیاو و پاوان و لەوەڕگاکان و داگیرکردن و دەســت بە سەرداگرتنی زەوی وزار و موڵکەکانیان کە بەوەش رژێم کۆمەڵێــک یاســا و بڕوانامەی نێوخــۆ و نێودەوڵەتی ژێر پێ خســت، نەمازە دەستووری کاتی عێراقی کە لە بەندی شــانزدەهەم /ج دا دەڵێ:(موڵکداریێتی تایبەتی داناماڵرێت

تەنهــا لــە بەرژەوەنــدی گشــتی و بەپێی بــۆ بژاردنێکی دادوەرانە نەبێت. بە پێی ئەو بنەمایانەی کە یاسا دیاریان دەکات). هــەروا بەندی (17) لــە جاڕنامەی جیهانی مافي مــرۆڤ تەئکید لە ســەر ئەوە دەکاتەوە هەموو کەســێک چ بــە تەنها یان بە هاوبەشــی لەگەڵ خەڵکی دیکەدا مافي موڵکــداری هەیــە و نابێت بەڕەمەکی و هــەروا لە گوترە موڵک لە هیچ کەســێک بســەنرێتەوە. بەو شــێوەیە رژێم مافي خاوەنداریەتی زەوی زەوت دەکرد، هەروەسا موڵکی ئەوانیشــی زەوت دەکرد کە خۆیان یا کەس و کاریان لە شــاخ بوون، جا ئــەو موڵکانە لە هــەر کوێیەک بووبن، و زۆر جار بە ئەنقەســت، ئەم موڵکانە بە نرخی باوەڕنەکراو بە جاشەکان دەفرۆشرا، بۆ ئەوەی وەک بەشێکی سیاسەتی جینۆســاید، کورد خۆ بە خۆ بە قڕ بدات و دوژمنداری و خوێنیان لە نێوان دروستبکات.

لــە ئەنجامی ئەوانەدا، رژێم لــە 75% ی خاکی بە پیت بۆ کشتوکاڵی لە کوردستان قەدەغە و لە کەڵک خست[44].
لە ناوچــە راگوێزراوەکاندا رژێم دامودەزگا و دامەزراوە گشتییەکانی دەوڵەتیشی وێران و خاپوور دەکرد نەخاسمە قوتابخانە و نەخۆشــخانەکان و ئۆفیســەکان و مزگەوت و کلیســاکان کە لە 1987 دا ژمارەیان گەیشــتە 2457 مزگەوت و شوێنی خواپەرستی و 85 دێر و کەنیسە[45]، دیارە ئەوەش هیچ پاســاودانێکی بــۆ نییە و بەندی (15)

له دەســتووری کاتی عێراقی بــە تاوانێکی زۆر گەورەی لــە قەڵەمدەدا وەک ددانی لەســەر داگرتــووە کە (دارایی گشتی، و مومتەلەکاتی کەرتی گشتی، حورمەتی تایبەتیان هەیە و لەســەر دەوڵەت و گشت ئەندامێکی گەل پێویستە بیانپارێزێ و شەونخوونی بە دیار ئاسایش و پارێزگاری کردنیانەوە بکێشێ و هەر تێکدانێک لەوانە، یا دوژمنکاری کردنیان، تێکدانە لە کیان و بوونی کۆمەڵ و دوژمنکارییە بــۆ ســەری) لە هەموویشــی خەتەرناکتر ژێر پێخســتنی موقەدەســاتی ئایینە ئاسمانییەکان و دەستدرێژی کردنە ســەر هەست و شــعووریانە، بە تایبەتی لە پەرپەرکردنی قورئانیــی پیرۆز و کتێبە پیرۆزەکانی تر، ئەوە لە حاڵێکدا بەندی چوارەمی دەســتووری عێراقــی کار پێکراو دەڵێ: (ئیسلام ئایینی دەوڵەتە)!.

دەستنیشــان کردنــی جوگرافیایــی ئەو شــوێنانەی کە خەڵکەکــەی بــۆ راگوێــزرا، هەمدیــس بــە هــۆی پلانــی بەروەختــەوە بوو، بە شــێوەیەک رێکخرابوون کە نێزیک ســەربازگە و تۆپخانــە و دامــودەزگا داپلۆســێنەرەکانی تــری رژێم بێت و وەک جــۆرە زیندانخانەیەکی گەورە لە ژێــر کۆنترۆڵ و چاودێــری خۆیەوە بێت، بۆ ئەوەی هەر کاتێک ویستیان بە ئاسانی مومارەسەی تیرۆر و ئازار و ئەشــکەنجەدان و شــوێن بزرکردن و لە سێدارەدانکردنی خۆیــان بکەن، لە رووی گــوزەران و کەش و هەوای ئەو

ئۆردوگا زیندانیانەشــەوە، شوێنی دەشت و بێ ئاو و بێ پیــت هەڵدەبژێــررا کــە نەخۆشــی دژوار و بەربڵاوی بە ئاســانی تێدا بڵاوببێتەوە، گریمان ئەگــەر بواری چاندنی دار و دەوەنیشی تێدا ببوایە، هەر قەدەغە بوو، بۆ ئەوەی ســوودی بژێوی لێنەبینن و نەشــبێتە پەناگا و وەسیلەی خۆ رزگار کردن.

پێداویســتییەکانی لانیکەمی ژیــان و گوزەران زۆر کەم بوو، نەخاســمە ئاو[46] و کارەباو هۆیەکانی گواســتنەوە، ئازووقــە و داو و دەرمــان و دکتــۆر و مامۆســتا و پێداویســتییەکانی خوێنــدن. هاتوچۆ و تێکــەڵاوی لەگەڵ شــار و ناوچەکانی دەوروبەردا لە بوارێکی زۆر تەسکدا بــووە و بۆ دامودەزگا مرۆییــە جیهانییەکان و ئاژانس و هۆیەکانــی راگەیاندنی جیهانیش بە تەواوی قەدەغە بووە کە ســەردانی ئــەم ئۆردوگا تەلبەندانە بکــەن بە بیانووی ئەوەی کە (ناوچەی سەربازین).

دیــارە کــە رژێم لــەوەدا هەر مەبەســتی جینۆســایدی جەســتەیی ئەو خەڵکە نەبووە بەڵکــو تێکدان و گۆڕین و لەبیربردنــەوەی خوو نەریت و رەوشــتی باووباپیرانیان بووە، جینۆســایدکردنی رەوشتی کۆمەڵایەتی کورد بوو، کە لە ژێر فشــاری برسیکردن و ئیرهاب و ژیانی مەمرە و مەژیــدا، زۆر ئافــرەت و خانەوادە ئیهانەی شــەڕەفیان کراو دەســتدرێژیان کرایە ســەر. (لەم بارەیــەوە، بڕوانە

پاشبەند).

خاڵێکی هەرە ترسناکتر سەبارەت بە هەتککردنی ئافرەت و نەهێشتنی کەرامەت و ئابڕووی کورد، فرۆشتن و بەخشینی بەشێک لەو ئافرەتانەی ئەو ئۆردوگایانە بوو (هێرشەکانی ئەنفال) لە هەندێک لە بازارەکانی دەوڵەتاندا، بە تایبەتی بەوانەی دەوروبەر وەک کوێت و سعودیە و دەوڵەتانی دیکەی کەنداو، کە ئەمەش لە شەڕی داگیرکردنی کوێتدا زیاتر دەرکەوت کاتێک کە هەندێک لەو ئافرەتانە لەوێ بینرابوون و بڕێکیان لەو کاتەدا خۆیان رزگار کردبوو و هاتبوونەوە کوردستان. چی ناو دەنێیت ئەمە، کە رژێم خەڵکانێک لە بازاڕی دەرەوەدا بفرۆشێت، رەگەزنامەی وڵاتەکەیان هەڵگرتووە ؟!!.

(بازرگانیکردن بە ئافرەت) لە مێژە تاوانێکی نێودەوڵەتی و جیهانییە و دادگای هەموو دەوڵەتان لە لێپرسینەوە و توێژینەوەیدا پسپۆڕن، ئەو کارە نامەردانە، پێشێلکردنێکی ئابڕووبەرانەی (رێککەوتننامەی قەدەغەکردنی بازرگانی کردن بە کەسان و ئیستغلالکردنی بەرەڵڵایی غەیرە) یە کە بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 317 (د- 4) لە 1949/12/2 دا دەرچووە و هەر لە دیباچەکەیدا ئاماژە بەوە دەکا کە پەتای بازرگانیکردن بە کەسان بۆ مەبەستی بەرەڵڵایی دەگەڵ کەرامەتی مرۆڤایەتی ناکۆکە و خۆشگوزەرانی خێزان و تاکەکەس و کۆمەڵ دەخاتە

مەترسییەوە.
بــاری نالەبــاری گــوزەران و برســێتی و دووری، یان نەبوونی قوتابخانە و پێداویســتییەکانی، وای لە زۆربەی ئــەو خانەوادانە کرد کە لە ئــۆردوگا زۆرەملێکان بوون، منداڵەکانیان، کە بناغە و ئەساســی کۆمەڵن، لە قوتابخانە دەربهێنــن و وازیــان پــێ لە خوێنــدن بهێنــن و بەکاری جۆراوجــۆری وایان خەریک بکەن کە لــە تواناى خۆیان بەدەربێت و تا شەو درەنگان لە دەرەوە بمیننەوە و تێکەڵی نێوەندی وابن لە ڕێیان لابدات و ئاکام نەوەیەکی گوم بوو و لە خۆنامۆ و غەریب و بێ ناسنامە دروستببێت، ئەوەش دیارە کــە پێچەوانــەی ناوەڕۆکی (جاڕنامــەی مافەکانی منداڵ)ــە کــە بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشــتی 1386 (د – 14) لە 1959/11/20دا دەرچووە، بە تایبەتی بنەمای دووەم لــەو جاڕنامەیە کە پارێزگاریکردنی تایبەتی منداڵ پێویســت دەکا و بنەمــای حەوتەم کــە فێربوونی بە زۆر و بەخۆرایــی بە مافی منداڵ حســێب کــردووە و بنەمای نۆیەم کە ناچارکردنی منداڵ لەسەر کارکردن یا پشتگوێ خستنی بە شێوەیەک کە لە هەر کار یا پیشەیەکدا ئیشبکات کە ئەزیەتی تەندروســتی بدات یــان زەرەر بە فێربوونی بگەیێنی یاخود ڕێ لە پێگەیشــتنی جەســتەیی و ئاوەزیی منــداڵ بگرێت، قەدەغە دەکات. هەروەهــا بەندی (26) لە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ دەڵێ: (هەموو کەس مافی

فێربوونی هەیە).
بە هەرحاڵ (قوشتەپە و باسرمە و باینجان و بەکرەجۆ و دیانا و کەورگۆسک و بنەسلاوە و چەمچەماڵ و کەسنەزان و جدیدە و مەنفاکانی نەجەف و کەربەلا و دیوانییە و سەحرا و بیابانی رومادی لە باشووری عێراق و سەر سنووری ئوردون و سعودیە)، نموونەی ئەو ئۆردوگا تەلبەندە زیندانییە زۆرە ملێیانەیە کە بەعس لە 3839 شارەدێ و دێهات و گوندی وێرانکراو و 219828 خێزان و 271 خەستەخانە و عیادە و خاکێکی سووتاوو بە ملیۆنان لوغم رێژی (45000) کیلۆمەتر دووجایی دروستیکردن.
بەو شێوەیە بەشێکی زۆری ئەو نەخشەی جینۆسایدکردنەی کە بۆ نێو سنووری عێراق کێشابووی، بەپێی توانا جێبەجێکرد و هەر لە گەرمەی ئەو تێکشکاندن و راگواستنەیشدا بوو کە رژێم بە ناوی مەجلیسی قیادەی سەورە بڕیاری ژمارە 1725 لە 1987/6/21 دا دەر کرد و تێیدا لە سێدارەدانکردن و تەقەکردنی لە هەموو ئەو شوێنانەدا حەلاڵ و یاسایی کردبوو! کە چۆڵکرابوون، دەرحاڵ پیادە کراو لە جێبەجێکردنیدا، بە دەیان و سەدان کەس لە خەڵکی بێ دیفاع لە شوان و گاوان و جوتیار و کاسب بوونە قوربانی، رەشایی چەندین گیانەوەر لە ئەنجامی شوبهاندنیان بە مرۆڤ، بە تەقە مردار کرانەوە

و لەوهێرشــانە قورســترین چەک و وەســیلەی کوشتنی وەک فڕۆکەی هێلیکۆپتەری سمتی بەکاردەهات[47].

**(2) شــارە گەورەکان ، تەهجیــر و تەعریب و ئابڵوقەی ئابووری ...**

راگواســتن و تێکشــکاندن، هەر ناوچە گوندنشینەکانی نەگرتــەوە، بەڵکــو بــەر لــەوەش شــاری کوردنشــینی کەرکووکیشــی گرتــەوە و تا ئێســتاش هــەر بەردەوامە. کەرکــووک لــە پاڵ ئەوەی کــە کوردی لــێ تەهجیر کرا، تەعریبیــش کــرا، ئەمەش لــە رێگای دەرکردنــی بڕیاری ناڕەوا و نامرۆڤانە بە جێنیشــینکردنی عــارەب (لەوانەی کە بە شۆڤێنیەت و رەگەز پەرستایەتی گۆش کرابوون و ئەلقە لە گوێی رژێم بوون). لە کەرکووک و دەورووبەریدا، لــە بەرانبــەر پارە و عــەرز و خانوو و پــڕ چەککردن و دەســەڵات پێدانــدا و بــە پێچەوانــەی ئەمــەوە کــوردی خەڵکــی کەرکووک هیچ ســەودا و مامەڵەیەکی بازرگانی و تایبــەت بە موڵکداری خانوو و زەویوزار و هێتریشــی لە دامــودەزگاکان بــۆ جێبەجێ نەدەبــوو و نابێت، وەک بیانییەکــی ئەرک لە سەرشــانی بێ ماف هەڵســوکەوتی لەگەڵ کراوە و دەکرێت، تەنانەت حسێبی عارەبێکی غەیرە عێراقیشــی بۆ نەکــراوە و ناکرێت کە بەپێــی بڕیارەکانی سەدام چەندین مافی وەک مافی عێراقییەکانیان هەبووە و

هەیە لەوانە سـەودای کڕینی موڵک و خانوو و لە وەزیفە و کار دامـەزران. کەچـی کـورد لە وەزیفـە دەردەکرێ لەگـەڵ هەمـوو توانا و کەفائەتێکی زانسـتی و هونەریدا، بواری دامەزراندن لە کاری نادرێ کە سەرچاوەی ژیانی زۆربـەی زۆرە و پرۆگرامـی قوتابخانـەکان بـە زبانـی عارەبیـن و ناوەڕۆکەکەیشـی بیروبـاوەڕ و ئـەدەب و مێژووی میللەتێکی ترە، تەنانەت ناوی قوتابخانەکانیش کە بۆ ماوەیەک (ماوەی دوای رێککەوتننامەی 11 ی ئازاری 1970) کرابوون بە کـوردی، گۆڕانەوە بۆ عارەبی، هەر بـۆ نموونـە: کاوە کرا بـە (معاذ بن جبل) و کوردسـتان بـووە (عبدالملـک بن مروان) و قوتابخانـەی زێوەر گۆڕا بـە (الاندلس) و 11ی ئازار کرا (سیسـلون) و کتێبخانەی ئاسۆ کرا بە (الطلیعة) و دارا بۆ (العروبة) وەرگەڕێنرا[48] کە دیارە ئەمە وەک جینۆسایدێکی کەلتووری و مێژوویی تەماشـا دەکـرێ. لە سـاڵی 1981 دا سیاسـەتی بەعس توندوتیژتـر بـوو و لەو وەختەدا بڕیـاری ژمارە 1391 لە مەجلیسـی قیادەی سـەورە بە 16 خـاڵ دەرچوو کە بـاس لـە دروسـتکردنی (20) هـەزار خانـوو دەکات لە ناوەڕاسـت و باشوور و راگواسـتنی چەندین کارمەند و کارگەری کورد لە کەرکووکەوە بۆ باشـووری عێراق، ب (بۆ دەقی بڕیارەکە: بڕوانە پاشبەند) بەڵام دیارە سەرقاڵی رژێم بە شـەڕی ئێران و چوونە نێو شـارەکانییەوە، لەو

وەختــەدا تەگەرەیــەک بــوو لــە بــەردەم جێبەجێکردنی تەواوی بڕیارەکەدا، هەروەها لە ناوەڕاسـتی هەشتاکاندا ڕژێم بڕیارێکی تری ســەبارەت بە شارەکان دەرکرد، کە ئارمانجەکــەی تەعریبکــردن و نەهێشــتن و تاواندنەوەی کورد بوو بە شــێوەیەکی ناراستەوخۆ، ئەویش لە ڕێگای هاندانی ماددیانەی خەڵکی شــارەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک کە بچن لە شــارەکانی ناوەراســت و باشووردا نیشــتەجێ بن و لە حاڵەتی کڕینی موڵک و خانوودا ڕژێم یارمەتییــان دەدات، بە پێچەوانەوەش هانی ناوەڕاســت و باشــووری دابوو کە بێنە کوردســتان و نیشتەجێ ببن لە بەرامبەر هەمان یارمەتی و ئیغراکردنی ماددیدا و بۆ ئەم مەبەستە (کەرکووک و بەغدا) هەڵاوێردرابوون!!.

لە ناوەڕاســتی هەشــتاکان (1985 بە دوا ...) گەرمەی شەڕی عێراق – ئێران بوو و لەو وەختەدا شتاق گەمارۆ و ئابڵوقــەی لــە هیچ جۆرێک لە ســەر عێــراق نەبوو، بە پێچەوانــەوە سیاســەتی ئەو کاتەی وڵاتانــی ئەورووپا و ئەمریکا و کەنداوی عارەبی (نەمازە کوێت و سعودیە) بە شــێوەیەک بوو کە هەموو یارمەتییەکی سەروو پێویستی ڕژێــم دەدرا و چاو لــە گەورە کەتنێکــی وەک (ئەنفال و کیمابیش) دەپۆشــرا و ڕژێم لە خۆشــگوزەرانی دا بوو و ســاڵانی ناوبراو، بە تەنها خەرجیی ســەربازیی خۆی لە دەیان ملیار دۆلار دەدا، ئا لەو وەختانەدا ڕژێم گەمارۆی

ئابووری خسـته سـەر تەنها سێ شـاری کوردستانەوە (دهۆک و سـلێمانی و هەولێر) و دەسـتی بە برسیکردنی خەڵکـی ئەم ناوچەیە کرد و بەدەر لە هەموو پارێزگاکانی عێراقـی، تەنها ئەم سـێ پارێزگایە سیسـتەمی کۆبۆن و ژیانی مەمرە و مەژی بەسـەردا سـەپێنرابوو، لەوەشـدا وەک ئاشکرایە مەبەستی رژێم ئەوە بووە کە کورد بخاتە بارێکـی گوزەران و بژێوی تژی خـراپ و ئیبادەیەکی بە شـێنەیی و لە سـەرەخۆ، بۆ ئەوەبووە کە خەڵکی واز لە ئـۆل و عەقیـدەی سیاسـی و نیشـتمانییان بهێنن و هەر عەودالی نـان پەیداکردن بن بۆ ئەوەش بووە کە نەتوانن یارمەتی پێشـمەرگەکانی مقاوەمەتی ئیبادەکردن بدەن و مەعنەویـات و ئیرادەی ئەوانیش شـلبکەن و ئاکام بە بێ مەرج بچنە ژێر باری مەرجەکانی رژێمەوە.

لەوەشـدا دیارە کە رژێم پێشـێلی بەندی (25)ی جاڕی جیهانـی مافي مرۆڤی کردووە کە دەڵێ:(هەموو کەسـێک مافي ژیانێکی تێرای هەیە کە بەشـی پاراستنی لەشساغی و خۆشگوزەرانی خۆی و خێزانی بکات ئەوەش خۆراک و پۆشاک و خانوو و چاودێری پزیشکی، هەروەها خزمەتە کۆمەڵایەتییە پێویستەکان دەگرێتەوە....).

هەروەها (پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابووری و رۆشـنبیری و کۆمەڵایەتییەکان)یش کە لە 3 ی کانونی دووەمی 1976 ـەوە ئامادەیە بۆ جێبەجێکردن لە لایەن

ئەو دەوڵەتانەی کە واژوویان کردووە یا بڕواییان پێداوە و عێـراق لایەنێکە تێیدا. لە بەنـدی (1/11) یدا، پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشێ کە دەوڵەتانی هاوبەش دان بەوەدا دەنێن کـە هەموو کەسـێک خۆی و خێزانەکـەی، مافی ئەوەیان هەیە لە ئاسـتێکی ژیانیی لە باردا بژیت بە شـێوەیەک کە پێداویسـتییەکانیان لە (خواردن) و جل و بەرگ و شوێنی حەوانەوە بۆ مەیسەر بکرێت....

دووهەم :

**راگواسـتن و دەرپەڕاندن بۆ دەرەوەی سنووری عێراق و کارەساتی کوردە فەیلیەکان**

بـە گوێـرەی دەرپەڕاندن و رەوپێکـردن بۆ ئەودیوی سـنووری عێـراق خـۆی لـە سـێ حاڵەتانـدا دەنوێنێ، یەکەمیان: ئەو کەس و کەسایەتی و خانەوادانە دەگرێتەوە کە لە دەسـت زوڵم و ستەم و ئەشـکەنجەدان و گرتن و برسـێتی و تالان و دەست بەسـەرداگرتنی موڵک و ماڵ، هەڵاتوون و لەژێر ئەو گوشـارە جەستەیی و رۆحییە بێ وێنەیـەدا ئاوارە و پەراگەندەی دەوڵەتانی ئەورووپا و دنیا بـوون و ژیانـی غەریبـی و دوورە وڵاتی دەبەنە سـەر. دووهەمیـان: ئـەو دەیان هـەزار بێ دیفـاع و بێ گوناهە دەگرێتـەوە کە لـە ژێر زەبر و فشـاری چەکی کۆکوژی کیمیایی و جینۆسـایدکردندا بەرەو سـنوورەکانی تورکیا

و ئێران رەویان کرد و پێشتر لە شوێنی تری ئەم کورتە باسەدا پەنجەنمای بۆ کراوە و ناگەڕێینەوە سەری.

سێیەمیان: کە بوار و مەبەست و مەودای باس کردنیمانە، راگواستنی بە بەرنامە و پلانی بەرەوەختی کوردە فەیلیەکانە لە سەر زێد و بنەجێی خۆیان و باب و باپیرانیان، بۆ دیوی ئێران. لە دوای هاتنی بەعس بۆ سەر تەختی حوکمی دیکتاتۆری، دەستی بە راگواستنی کوردە فەیلییەکان کرد نەخاسمە سالانی 1969 – 1972 زیاتر لە (70) هەزار کەس تەرحیل کران، بەلام راگواستنی بەر بلاو و کاریگەر لە نیسانی1980 دا دەستی پێکرد[49]، ئەو وەختەی رژێم بە دەیان هەزار (نزیکەی 120 هەزار) کوردی لە ژێر باروزرووفێکی زۆر نالەبار و وەحشیانەدا، بە چەند وەجبەیەک بە زۆری بە (زیندانخانەی گەڕۆک) کە هەر بۆ گومانباران بەکار دەهێنرێت، بێ ئەوەی بزانن بۆ کوێیان دەبەن و چییان لێدەکەن و چ تاوانێکیان کردووە و چارەنووسیان رووی لە چ ئاقارێکە؟!! . بێ ئەوەی مافی داکۆکی لەخۆکردنیان هەبێت بە تەوقیف کراوی و بە بێ ئاو و نان فڕێ درانە سەر سنووری ئێران و لە ولات وەدەرنران.

ئەگەر چی (گریمان) ئەو کوردانە تاوانبار بوون، خۆ بەپێی دەستوور و یاسای سزادانی عێراقی تاوان دراوە پال بێ گوناهە تا پێچەوانەکەی دەسەلمێنرێ (بەندی

بیستەم/ء، لە دەستوور)، مافی داکۆکیکردن پیرۆزە (بەندی بیستەم / ب لە دەستوور).

هەروەهـا بەندی (1/11) لە جاڕی جیهانی مافی مرۆڤ دەڵێ: (هەموو مرۆڤێکی گومانبار بە تاوانێک، بێ گوناهە، تاکـو لە دادگایەکی ئاشـکرادا لە هەمـوو هەلومەرجێکی پێویسـتی داکۆکـی لە خۆکردنـی بۆ دابیـن دەکا، بەپێی قانوون، تاوانەکەی دەسەلمێنرێت)..

ئەو کوردانە دوای ئەوەی فڕێدرانە سـەر سـنوور، بەو ئیعتبـارەی کـە ئێرانی نەبوون، لەو دیو، کەسـێک نەبوو وەریان بگرێ یا پێشوازییان لێبکات، رەنگە هەر ئاگاداریش نەبووبن! بۆیە هەر لەوێدا و بە دووری چەندان کیلۆمەتر بـە کۆچڕەو بـە نێو بیابان و گەرما و بـە بێ ئاو و نان، رێیـان بڕیوە و بـە منداڵ و ژن و پیـرەوە ملیان دابووە بەر و لێرە و لەوێ هەبوون کە لە برسـێتێ و تینوویێتیدا (بـە تایبەتـی ژن و منـداڵ) گیانیان لە دەسـتداوە و هەر لەوێشـدا ژێر گڵ کراون، گەڕانەوەش بۆ سنووری عێراق بەپێی بروسـکەی نهێنی وەزارەتی ناوخۆی عێراق ژمارە 2884 لە 1988/4/10 دا کوشتنی لەسەر بووە وەک لە کۆتاییەکەیدا دەڵێت: (.....تەئکیدی فەرمانەکەمان دەکەینەوە بـە تەقەکـردن لەوەی کە هەوڵی گەڕانـەوە بۆ نێو خاکی عێـراق دەدات، لەوانـەی کە راگوێزران. تـەواو....)[50]. لە دوای رەزامەنـدی وەرگرتنیشـیان لـە لایەنـی ئێرانەوە

(کــە وێ دەچێ زیاتر لــە ڕووی ئینســانییەوە بوو بێت) لــە خێوەتگاکانی ئەوێ دا لە لانیکەمــی گوزەران و ژیان بێبەش بوون[51].

کوردە فەیلییەکان، چ وەک (پەیوەندی خوێن) بەوەی کە دایک و باوکەکانیشیان عێراقی بوون، چ وەک شوێنی (لە دایکبوون) بەوەی کە لە ســەر خاکــی عێراقدا هاتوونەتە دنیــاوە، عێراقــی بوون و زۆربەی زۆریشــیان ویلادەتی سیانی (الولادة الثلاثية) بوون نەک هی دووانی، واتە خۆیان و باوکیان و باپیریان لە سەر خاکی عێراقدا لە دایکبوون، ئەمانە هەمووی بەپێی یاســای ڕەگەزنامەی عێراقی[52] و هەر لە سەر یەک یا گشت ئەو بنەڕەتانەیش ڕەگەزنامە و زۆربەی ئەو بڕوانامانەیان هەبووە کە ئیسپاتی عێراقیەتی کردوون، بێجگە لەوەش ئەوان لە دامودەزگاکانی دەوڵەت بەشدار بوون و پلە و پایەیان تێدا هەبووە و لە بازرگانیدا ڕەها بوون و هیچ کۆت و بەســتێکی تایبەتییان لە ســەر نەبووە و بازرگانی هێنان و ناردنیان کردووە و مامەڵە و سەودای کڕین و فرۆشتنی موڵک و ماڵ و خانووبەرەیان بە ڕەسمی لە دامودەزگاکانی دەوڵەتەوە کردووە کە ئەوانە لە ڕووی یاساییەوە هەر بۆ عێراقییەکان ڕێگا پێدراوە.

لە هەموانیش گرینگتر٭ خزمەتی سەربازییان کردووە، کە ئەمە لە زۆربەی دەوڵەتانی دنیادا مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ بە هاونیشتمانی بوون. کەچی ڕژێم لەکاتی ڕاگواستنیاندا

هەر هەموو رەگەزنامە و ناسـنامە و بڕوانامەکانی تریان لێسـەندن و سـەنەد و تاپۆ و عەقدی خانوو و زەویوزار و موڵکەکانیـان (دوور لـە هەموو عورفێکـی ئەخلاقی و ئینسانی و یاسایی) لێ زەوت کردن[53].

جگە لـەوەی زۆربەی خانەوادەکانیـان لێک دابڕ کردن بـەوەی کە منداڵی سـاوا یـا هـەرزەکار و گەنجەکانیان دەهێشـتنەوە و ئەوانی تریان وەدەردەنان یاخود پیاو، یا ئافرەتیان دەگرت و زەوت دەکردن......[54]

دیارە کە بڕوبیانوی ڕژێم لە وەدەرنانی پڕ مەرگەساتی فەیلییـەکان ئـەوە بـوو کـە ئەمانـە ئێرانین و ئێسـتاش عێراق شـەڕی لەگەڵ ئێراندا هەیە و ترسـی خراپەکاری و تێکدەریـی لەوان دەکرێ، بەڵام ئەمە هیچ ڕاسـتییەکی تێدانییە چونکە ڕاگواسـتنەکە لە مانگی نیسانی 1980/4 دا بووە واتە (5) مانگ بەر لە دەسـتپێکردنی شەڕ و بەر لـەوەش لـە 1969 و 1971 دا ڕژێـم ئەو سیاسـەتەی جێبەجـێ کردووە. لەوەی کە ئێرانیش بێ ئەگەر وا بوایە خزمەتی سەربازییان پێنەدەکرا و ڕەگەزنامەیان پێنەدەدرا و بوار نەدەدرا کە مومارەسـەی کڕین و فرۆشتنی موڵک و زەویوزار بکەن وەک باس کرا.

لە 1980/7/5 دا کە هێشـتا دوو مانگی مابوو شـەڕی عێراق- ئێران دەست پێبکات، مەجلیسی قیادەی سەورە، بۆ پیادەکردنی پیلانە گڵاوەکەی لەوەدەرنان و تەفروتوناکردنی

بەشێکی تری کورد کە فەیلییەکانن، بڕیاری ژمارە 666ی دەرکرد، کە لە دیوی ئەودیویدا نیشتمانپەروەری و کورد پەروەریی فەیلییەکان دەردەکەوێ بەوەی کە ئەوانە دژی ئینقلابــە شــوومەکەی 17 ی تەممــوزی 1968ن، بۆیــە دەردەکرێن (بڕوانە پاشبەند).

لــە ســالی 1981ــەوە تــا 1989 ئــەم هێرشــە هــەر بــەردەوام بــووە، واتــە هــاوکات لەگەڵ ماوەی رەشــی ئەنفالە بەدناوەکاندا، راگواستنی کوردە فەیلییەکان درێژی هەبووە و بڕیاری دیکەی لە مەجلیسی قیادەی سەورەوە دەرهەق جێبەجێ کراوە کە شیرازەی خێزانی تێکدا و لێکی هەڵوەشاندەوە و خۆی لە ژیانی تایبەتییان هەڵقورتاند، کە ئەمــەش بووە هــۆی راپێچکردنی زیاتر لــە (30) هەزار کەســی تــر، بڕیاری ژمارە 474 کە لــە 1981/4/15 دا دەرچووە، گوزارشــت لە تێکدانی ئەو شــیرازەیە دەکات و هانــی هاوولاتیــان دەدات بەوەی وەک خــۆی دەڵێت ئەگەر (ژنە بەرەگــەز ئێرانییەکان) تەلاق بدەن ئەوا رژێم بارووبووی ماددییان دەکات و مەبەســتیش لەوەدا ئەوە بــووە کــە خەڵکی زیاتر بــۆ ئەودیو ســنوور راپێچ بکات و دیــوی ئەو دیوی ئــەم بڕیارەش وا دیــاری دەدات کە ئەگــەر لەژێر ئەم ئیغرائاتە ماددییانــەوە نەیکەن، ئەوا بە زۆر بــە یەکتریان تــەلاق دەدەن و خێزانەکە لە باڵ یەک دەردەهێنن، چونکــە هێندێکیان دەگیرێن و گل دەدرێنەوە

و ئەوانی تر رادەگوێزرێن (وەک ئاماژەی بۆ کرا)... دەقی بڕیارەکە وا نووسراوە.
بەپێی ئەحکامی برگە ( ء) لە بەندی چل و دووەمین لە دەستووری کاتی، مەجلسی قیادەی سەورە، لە دانیشتنی رۆژی 1981/4/15 بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا:
(1) هەر پیاوێکی عێراقی کە ئافرەتێکی تەبەعییەی ئێرانی هێناوە، بڕی چوار هەزار دیناری بۆ سەرف دەکرێ، ئەگەر عەسکەری بێت و دوو هەزار و پێنج سەد دینار ئەگەر مەدەنی بێت، لە حاڵێکدا ئەگەر ژنەکەی خۆی تەڵاق بدات یا خود لە حاڵەتی تەسفیرکردنیدا بۆ دەرەوەی وڵات.
(2) لە بەخشینی بڕی پارەی ناوبراو لە 'بڕگە (1)'ی ئەم بڕیارەدا مەرجە حاڵەتی تەڵاق یان تەسفیر کردن ئیسپات ببێت بە هۆی تەئیدیکەوە لە لایەنی رەسمیی پسپۆرەوە و (عەقد)ی ژن هێنانێکی نوێ لە ئافرەتێکی عێراقیدا بکرێت..
دوای دەرکردنی ئەم بڕیارە بە هەفتەیەک، نوسینگەی رازگرێتی .- لە مەجلیسی قیادەی سەورە، کیتابێکی خۆیی و نهێنی لە 1981/4/22 بە ژمارە 2469/12/31 دەرکرد، کە تێیدا بڕیاری ناوبراو، روونتر دەکاتەوە و رێنمایی پێویست بۆ جێبەجێکردنی دەدات لەوانە: بڕی ئەو پارەیە تەنها بەو کەسانە دەدرێت کە بەر لە دەرچوونی ئەو بڕیارە ئەو ژنانەیان لە لابووە و لە کاتی تەڵاق و

دەست لێبەردانددا دەبێت وەزارەتی داد ئاگاداری وەزارەتی ناوخۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی ئافرەتە تەڵاق دراوەکە تەسفیر و راپێچی دەرەوە بکات، هەروەها دەبێت ئەو کەسە جارێکی تر ژنی (ئێرانی) نەهێنێتەوە، پێچەوانەی ئەوە هەموو پارەکەی لێوەردەگیرێتەوە.

رژێم هەر بە تەنها سیاسەتی راگواستن و دەرپەراندنی دەرهەق بە کوردە فەیلییەکان جێ بە جێ نەکرد، بەڵکو زۆربەی زۆری ئەوانەی کە لە کاتی تەرحیلەکەدا گلی دابوونەوە، لە سێدارەدان و شوێن بزریکردن و بە دەم ئازار و ئەشکەنجەدانەوە لە گرتووخانەکانی قایمکردن، ئەمەش ژن و پیاو و منداڵ و هەرزەکاری لە تەمەنی 14 تا 45 ساڵی گرتەوە و تا ئێستاش زیاتر لە (10) دە هەزار کوردی فەیلی بە دەست رژێمی بەغداوە بێ سەر و شوێنن و لەوەدا رێکخراوی مافی مرۆڤی کوردە فەیلییەکان لە عێراق/نەمسا/ یادداشتنامەیەکیان لە 1992/2/28 دا بۆ بەرێز ئەمینداری گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان بەرز کردەوە کە تێیدا داوای چارەنووسی ئەو چەند هەزار کوردە دەکەن، بەڵام وا پێدەچێ بە دەردی رووداو و کارەساتەکانی تر، پشتگوێ خرابن و سکرتێری (UN) لێیان نەپێچابێتەوە، لێرەدا بە پێویستی دەزانین وەک بەڵگەنامەیەک دەقی یادداشتنامەکە بڵاوبکەینەوە :

**بەڕێز سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان**
**د. پوترس غالی**
1992/2/28
**بابەت /بەهاناوە هاتنی زیندانییەکان لە کوردەفەیلییەکان**
**سلاوێکی گەرم :**

ڕێکخراوی مافی مرۆڤ بۆ کوردە فەیلییەکان لە عێراقدا، کە بەرپرسیاریتی داکۆکیکردن لە مافی کەمینەی چەوساوە لە کوردە فەیلیە عێراقییەکانی وەئەستۆ گرتووە، جەختی ئەوە دەکاتەوە کە تا ئێستا زیاتر لە دە هەزار زیندانی لە فەیلیە کوردەکان کە لە نێوان سالی 1980 تاکو سالی 1992 گیرا بوون، لە زیندان و گرتووخانەکانی عێراق، بە بێ هیچ پاساوێکی یاسایی دەنالێنن، لە هەمان کاتدا حکوومەتی بەغدا هیچ زانیارییەکی دەربارەیان نەداوە، و کەس و کاری گرتووەکان بۆ ئێران راگوێزراون و بە تەواوی سەبر و ئارامییەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی منداڵەکانیانن و تکا لە بەڕێزتان دەکەین کە بەخێرایی تەدەخول بکەن لە پێناوی بەرەڵلاکردنیاندا"[55].

دەقی یادداشتنامەکە وەک دیارە تەئکید لەوە دەکاتەوە کە (کەسوکاری زیندانییەکان لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی منداڵەکانیانن). بەو مانایەی رژێم جگە لە تەرحیل و گرتن و کوشتن و شوێن بزرکردن، سیاسەتی لێک هەڵوەشاندنەوە

و لــە باڵ یەک دەرهێنانی خێزانیشــی پەیڕەو کردووە کە واتــای بــەرەو هەڵدێربردنی کۆمەڵگــە دەگەیەنێ، چونکە خێــزان بــەردی بناغەکەیەتی، لێــرەدا رژێم بــە تەواوی پێزانیــن و هەســت پێکردنــەوە، ئەمــەی وەک وێنەیەکی جینۆساید لەســەر کورد پیادە کردووە، بێ ئەوەی گوێی بۆ ئەو دەســتوورەش هەڵخستبێ کە خۆی دایڕشتووە و دەریکــردووە کە لە بەنــدی (11)یدا دەڵێ: خێزان کرۆکی کۆمەڵــە، دەوڵەتیــش پاراســتنی و پشــتگیریکردنی زامن دەکات و دایکایەتی و منداڵێتی چاوەدێری دەکا) یا بەندی (3/16) لــە جــاڕی جیهانی مافی مرۆڤ کە دەقنووســی ئــەوەی کردووە:(خێزان یەکەیەکی سروشــتی و بنەڕەتی کۆمەڵگایــە و مافــي ئەوەی هەیە کە لــە لایەن کۆمەڵگا و دەوڵەتەوە بپارێزرێت).

هەروەهــا پەیمانی نێودەوڵەتــی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان لە هەمان هەستپێکردندا لە بەندی '1/23' پێی لە ســەر ئــەوە داگرتووە کــە (خانــەوادە یەکەیەکی جەماعــی سروشــتی و بنەڕەتییە لە کۆمەڵــگادا، و مافي پاراســتنی هەیە لەلایەن کۆمەڵ و دەوڵەتەوە). سەرباری ئەوانــەی پەنجەنمایان بۆ کرا، ئــەوەی کە رژێم دەرهەق بــە کــوردە فەیلییەکانی ئەنجامداوە، پێچەوانە و پێشــێلی کۆمەڵێک یاســا و بەڵگەنامەی نێوخۆ و نێودەوڵەتییە، کە گرینگترینیان، ئەو پۆلێنانەی خوارەوەیە:

(1) راگواستن: بەندی (1/13) لە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ وای دەقنوس کردووە کە : (هەموو کەسێک ئازادی هاتوچۆ و هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێ بوونی لە نێو سنووری هەر دەوڵەتێکدا هەیە).
(2) گرتن و زیندانیکردنی بێدادگایی: بەندی (9) لە هەمان جاڕنامەی ناوبراو دەڵێ (هیچ مرۆڤێک نابێت بە شێوەیەکی رەمەکی بگیرێت، دەست بەسەر بکرێت، یان دوور بخرێتەوە).
(3) ئازار و ئەشکەنجەدان: بەندی (5) لە جاڕی جیهانی بە روونی دەری بڕیوە کە هیچ مرۆڤێک ئەشکەنجە و سزا نادرێت و رەفتاری توند و تیژ و دڕندانە و ئابڕووبەری لەگەڵدا ناکرێت. هەروا بەندی (1/2) لە پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان هەمان تەئکیدی کردۆتەوە.
(4) لێسەندن و زەوتکردنی موڵک و ماڵ : بەندی شانزەدەهەمین/ح لە دەستووری کاتی عێراقی دەڵێ:(موڵکدارێتی تایبەتی داناماڵرێ ئەگەر بۆ پێداویستییەکانی بەرژەوەندی گشتی نەبێت...) هەروەها بەندی (17 /2 ) لە جاڕنامەی جیهانی: (نابێت بەرەمەکی موڵک لە هیچ کەسێک بسەنرێتەوە) .
(5) بیانووی (عێراقی) نەبوون: لە کاتێکدا خەتەرناکترین و ناسکترین ئەرک کە هەر بە هاونیشتمانی دەکرێت

ئەویش خزمەتی سەربازییە، پێیان کراوە و بۆ ئەمە بەندی (31/ء) لە دەستووری کاتیی عێراقی دەڵێ:(داکۆکیکردن لە نیشتمان ئەرکێکی پیرۆزە و شەرەفە بۆ هاونیشتمانی، و خزمەتی سەربازی بە خورتییە.. ) و لە ( 31/ ب ) دا ئەوەی دەقنووس کردووە کە ( هێزە چەکدارەکان مولکی میللەتە و ئامرازیەتی بۆ پاراستنی ئاسایشەکەی و داکۆکیکردن لە سەر بەخۆیی و ..... ).

بەو پێیە بەشداری کردنی کوردە فەیلییەکان لە خزمەتی سەربازیدا بەڵگەیەکی بەهێزی بە عێراقی بوونیانە، جگە لەوەش ئەوان لە کڕینی مولک و ماڵدا بەپێی یاسا و وەک هەر هاوولاتییەک ئازاد بوون، بەندی (17) لە دەستووری کاتی لەو بارەیەوە وا تێکستنووس کراوە (مولکدارێتی خانوبەرە بۆ غەیرە عێراقی قەدەغەیە، تەنها ئەوەی بە یاسا هەڵنەوێردرابێت) دیارە ئەم هەلاوێردنەش بۆ هەندێ دەوڵەتانی کەنداو و عەرەبییەکان بووە !!.

(6) سەندنەوە و زەوتکردنی رەگەزنامەی عێراقی: کە بەپێی بەندی (15) بڕگەی (1 و 2) لە جاڕی جیهانی ئەو مافەیان پارێزراوە کە دەڵێ:

1/ هەموو کەسێک مافی بوونی رەگەزنامەی هەیە.

2/ نابێت بەزۆر رەگەزنامە لە کەسێک بسەنرێتەوە یان مافی گۆڕینی نەدرێتێ).

لە کاتێکدا ئەوانە، بە شێوەیەکی یاسایی نیشتەجێی

خاکی عێراق بوون و بەپێی مەرجەکانی یاسـایی عێراقی لـە وەرگرتنـی ڕەگەزنامەدا کە (پەیوەنـدی خوێن) و (لە دایکبوونە لە سـەر خاکی عێراق) یان یەکێکیان، بوون بە هاوولاتی عێراقی، بەلام وەک دیارە مەبەستی بەرەودوای ڕژێم نەهێشـتن و تەفروتووناکردن و جینۆسـایدکردنی کـورد بـووە و هەوڵیـداوە بەپێـی توانـا لە ڕێـگای ئەو بڕوبیانـووە بـێ بنەڕەت و بێ سـەروبەرانەدا، لە ڕووی ڕای گشـتی جیهانیدا (ئەگەر حیسابێکی بۆ کردبێ) پاساو بۆ خۆی بهێنێتەوە!!.

## پشکی چوارەم :
## نەزۆککردن یان جینۆسایدکردنی بایۆلۆژی

لەو مەبەسـت و مەنزوورەی ئێـرەدا، نەزۆککردن (کە رژێم لە پاڵ رێگاکانی تری جینۆسایدکردندا ئەنجامیدەدا)، بە مانای وەسـتاندنی زیادبوونی کۆمەڵێکە بە مەبەسـتی بەرەبـەرە کەمکردنـەوەی ژمارەیان، ئـەوەش لە رێگای چەنـد هـۆ و ئەگەرێکـی راسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆوە دەکرێ کە مەترسـیدارترینیان خەسـاندنی پیـاوان و لە کەڵک خسـتنی ئەندامی زاوزێی ئافرەتەکانیەتی، دیارە کە ئەوەش گەورە کەتنێکی جینایی و سیاسـی و نیشـتمانی مەزنـە و لە (ئاکام) دا لەگەڵ (نەزۆکـی) یەک دەگرنەوە، بـەڵام لە (هۆ) دا جیاوازییەکـی جەوهەریی هەیە، بەوەی

هۆی نەزۆکی لایەنی فسیۆلۆژی و کەموکورتی جەستەیی پیاو یان ئافرەتە، کەچی نەزۆککردن دەسکاریکردن و دەستدرێژییە بۆ سەر سەلامەتیی لەش و جەستەیێکی ئامادە و بێکەموکورتی[56]. ئەو دەستدرێژییەی بەندی (3) لە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ نەهی لێکردووە.

ئەو حاڵەتەش کە رژێم لە چوارچێوەی نەخشەی لە نێوبردنی کورددا بە سەر دەیان هەزار کەسی هێناوە، نوێ نییە و بەر لە دەیان سەدە هەبووە و ئەم بەوردی سوودی لێبینیوە و داهێنانی تێدا کردووە، گەلانی کۆنی رۆژهەڵاتی لە بابەتی بابلییەکان و ئاشوورییەکان و فارسەکان و میسرییەکان، بە تایبەتی لە ماوەی سیستەمی کۆیلایەتیدا، راستەوخۆ خەڵکیان خەساندووە، ئەویش بە برینی هەردوو ئەندامی زاوزێی پیاوان، یەکێکیان یا خود برینی ئەو دەمارانەی کە پێکی گەیاندوون. ئەوانەی ئەم دەستدرێژیانەشیان لە سەر بووە، یا دیلەکانی شەڕ و منداڵەکانیان بوون، یان وەک سزای دزی و زینا و خیانەت و ناپاکی دەسەپێنرا[57].

جگە لە خەساندنی کۆیلەکان، لە روانگەی ئایینیشەوە مەسیحییەکان لە چاخەکانی ناوەراستدا منداڵەکانیان دەخەساند، بۆ ئەوەی ببن بە (راهب)، بەڵام ئیسلام (کە بەپێی بەندی چوارەمی دەستوور ئایینی رەسمی دەوڵەتی عێراقە)، خەساندنی قەدەغە کردووە و بە ئەشکەنجەدانی

له قه‌ڵه‌مداوه، هه‌ر وه‌ک پێغه‌مبه‌ر ( د.خ) فه‌رموویه‌تی (من خصی عبدا خصیناه)[58].

له نیوه‌ی یه‌که‌می سه‌ده‌ی بیسته‌میشدا نه‌زۆککردن وه‌ک سزایه‌ک ده‌رهه‌ق به تاوان پیشه‌کان و لاده‌ره سێکسییه‌کان و ... خرایه‌گه‌ڕ، هه‌ر بۆ نموونه له ئه‌ڵمانیای نازیی و هیتله‌ردا له 1933/7/14 یاسایه‌ک ده‌رکرا بۆ له‌نێوبردنی هه‌موو ئه‌وانه‌ی ره‌گه‌زی جه‌رمه‌ن ده‌شێوێنن و تێک ده‌ده‌ن، به‌لام له دوای ژێرکه‌وتنی هێزه‌کانی هیتله‌ر ئه‌م یاسایه پووچه‌ڵ و ئیلغا کرایه‌وه. ئێستاشی له‌گه‌ڵ دابێت هه‌ندێک ده‌وڵه‌تی وه‌ک سوئێد و فنله‌ندا و دانیمارک و هه‌ندێک له ویلایه‌ته‌کانی که‌نه‌دا و ئه‌مریکا به‌پێی پێداویستی یاسایی و ته‌ندروستی، نه‌زۆککردن له قانونه‌کانیاندا ماوه[59]، له نه‌زۆککردنی کۆمه‌ڵی کورددا رژێم په‌نای وه‌به‌ر چه‌ند هۆکارێکی سه‌ره‌کی، ئێکسه‌ره‌و لاوه‌کی داوه، که ده‌کرێ له چه‌ند خاڵێکدا ئاماژه‌یان بۆ بکه‌ین:

(1) هۆکاره راسته‌وخۆکان: وه‌ک خه‌ساندنی پیاو و ده‌رمان خواردکردن یا بڕین یان لابردنی ئه‌و ئه‌ندامانه‌ی له‌شی ئافره‌ت که ده‌بنه هۆی دروستبوونی منداڵ وه‌ک لابردنی هێلکه‌دان.. دیاره رژێم له رووی عه‌مه‌لییه‌وه ئه‌مه‌ی زیاتر له گرتووخانه و به‌ندیخانه‌کاندا ئه‌نجام ده‌داو ئه‌م هۆیانه‌ی به‌کارده‌هێنا: سووتاندن و ئوتوو کردنی ئه‌ندامی

زاووزێی گرتووەکان بە پارچە ئاسـنی سـووربووەوە یان بە جگەرە و تێ ئاخنینی هێلکەی کوڵیوی داخ بوو لە کونی زاوزێی ئافرەتدا و لە کاتی بێ نوێژییاندا بە رووتی و لنگە و قوچ هەڵواسـینیان بۆ ئەوەی خوێنەکە لە شوێنی خۆی قەتیـس بمێنێ و بمەیێ یـا بڕژێتەوە نێو دەمی، کە دیارە ئەوەش شیمانەی منداڵ نەبوونی زۆرە.

هەروا بێتەوە دەست و پێ بەستنەوەی زیندانی و نزیک خستنەوەی لە سـۆپای کارەبایی دیوار بۆ ئەوەی زگ و پشـت و ئەندامی زاوزێی بسوتێنێت، بەستنەوەی زیندانی و لەسـەر دەم خسـتنی لەسـەر چوار پایەیەک و پاشان رووتکردنی ئەندامی زاوزێی و تێبەردانی جروجانەوەری بچووک و بەزەڕ، یا لێ نزیکخستنەوەی سەگ یا پشیلەی راهاتوو لە ژێرەوە (بڕوانە پاشبەند).

بەکارهێنانـی گیـراوەی ترشـی کبریتیـک و گوشـینی ئەندامی زاوزێی پیاو بە هۆی بۆڕیی تەسـکەوە و بڕینی گونـی پیاو و بەکارهێنانـی دەرزییەکانی نەزۆک بوون و هیستریا و شلکردن و داهێزراندنی لەش بە هۆی هۆرمۆنی جیاوازەوە. جگە لە تێکردنی هۆرمۆنی (پیاوەتی) لە لەشی ئافرەتدا و تێکردنی دەرمانی لە پیاوەتی خسـتن لە لەشی پیاودا و لێدانی هەردوو ئەندامی زاووزێ و بەسـتنەوەی گون یا وردکردنی بە ئاسـن یاخود دەرکێشـانی بە داو، هەروا بێتەوە بەسـتنەوەی سەری ئەندامی زاوزێی پیاو،

یـا هی ژن بە جەمســەری کارەبایی (بگەڕێوە پاشــبەند، شــێوازەکانی کوشــتن و ئەشــکەنجەدان). بە هەزاران لە بارزانییــەکان، هەروەهــا لــە قوربانییەکانی تــری ئەنفالە بەدناوەکان، غەیرەز ئەوەی کە خوێنیان لێ وەرگرتوون، خەسێنراویشن، بەدەر لەوەش، وای دابنێ ئەوانە گشتیان لە ژیان دابن و شــتاقیان دەســت لێ نەدرابن!!. تەنها لێک دوور خســتنەوەیان و لە باڵ یــەک دەرهێنانیان خۆی لە خۆیــدا دەبێتە هــۆی لاوازبوون و وەســتاندنی زاوزێ و گەشە کردن و زیادکردنیان.

دەرزی نــەزۆک بــوون، (وەک لە نێو خەڵکــدا باو بوو) رژێـم لــە هەشــتاکاندا بــە کاری هێنــا، کاتێک بــە ناوی نەخۆشــی منداڵ و نەخۆشــییە بەربڵاوەکان، هەســتا بە تەرخانکردن و پێکهێنانی چەندین مەفرەزەی پزیشــکی و گەڕانیــان بە گوند و شــارەکاندا و بۆ ئەوەی لە ژێر ئەو پەردەیــەدا دەرزی منداڵ نەبوون لە کچان و ژنانی کورد بــدەن و بەردەوامیش بوون لە ســەر ئەو تاوانە گڵاوە تا دوای 1991، وەختێــک لە (بازگەکانیــان) دا بە بیانووی گومانکردن لەو کەسانەی کە لە کوردستانەوە بۆ مووسڵ و بەغدا دەچن بەوەی نەخۆشی ئایدز و هی تریان هەبێت، هەمدیس ئەو دەرزییانەیان بەکارهێنایەوە!

(2) باری سایکۆلۆژی و دەروونی: حاڵەتی تێکشکاندنی نەفســی و رۆحیی ئافرەت و پیاوی ئەشکەنجەدراو، چ لە

گرتووخانــەکان، یا لە ئـۆردوگاو زیندانییەکاندا یاخود لە دەرەوەی ئەم دوو حاڵەتەدا بەوەی کە رژێم دەســتی بە هەموو لایەک رادەگەیشت، کاریگەرییەکی سلبیانەی زۆری بەسەر نەزۆکی و منداڵ نەبوونەوە هەیە و ئازاردانەکانی زیندان و شەڕی دەروونی و بێ دەسەڵاتی لە ئاست زوڵم و زۆر و ســتەمدا، رەنگدانەوەیەکی خراپی بەســەر باری تەندروســتی و سێکســی مرۆڤەوە دەبێت و ئەگەر نەبێتە هۆی نەهێشــتنی (پیاوەتی) یا لە هێلکەوەســتانی ئافرەت، ئەوا بێشــک دەبێتە هۆی (کەمکردنــەوەی ئەم توانایە) و لــە ئاکامدا منداڵ نەبــوون، نەزۆکی و لە پیاوەتی کەوتنی کاتیــش (العنــة المؤقتە) یەک لە هۆیەکانــی خراپ بوونی باری دەروونییە.
ئـۆردوگا زۆرەملێیەکانیـش جیاوازییەکی جەوهەرییان دەگــەڵ گرتووخانەکانــدا نەبووە و ئازاردان و برســێتی و بەدخۆراکــی و چەندەهــا گیروگرفتــی کۆمەڵایەتــی و رەنگدانەوەی لەســەر باری نەفســی خەڵکەکــە هەروەها خراپبوونی بــاری گوزەران و دڵەڕاوکــێ (و نیگەرانی و راوەدوونان و ترس و ئیرهاب و هەڵاتن و خۆشاردنەوەی خەڵک بە شێوەیەکی گشــتی، کاری نیگەتیڤانەیان بەسەر حاڵەتی نەزۆککردنەوە هەبووە و هەیە، چ بە شــێوەیەکی بەردەوام یا وەختی.
(3) پیس بوونی ژینگە: ئەو حاڵەتە زیاتر لە تەقاندنەوەی

900 بیرە نەوتی کویتی لە 1990 – 1991 دا بەرجەستە بـوو و ئەنجامـی خراپـی لێکەوتـەوە، لـەوان وەختانـدا ئاسمانی کوردسـتانیش لە جیاتی بارانی خاوێن، کاربۆن و ترشەڵۆک و گازە ژەهراویەکانی تری بەسەر خاکەکەیدا دەباراند، کە بووە هۆی ژەهراویکردنی کشتوکاڵ و پاوان و لەوەڕگاکانیش، بەوەش کاری کردە سەر نەزۆک بوون، ئەمە و جگە لە پشت گوێ خستنی نەهێشتنی پاشماوەکانی بەکارهێنـان هەروەها فەرامۆشـکردنی پرۆژەکانی ئاو و تێکەڵبوونیـان بە ئـاوی ئاوەڕووە لە زۆر شـوێندا، ئەوە سـەرباری کەمیی ئاوەکەش لە خـودی خۆیدا، هەروەها گەمـارۆی ئابـووری کـە لە 1991ـەوە رژێم بەسـەر هەرێمی کوردستانی داسەپاند، بووە هۆی برینی ئازووقە و سـووتەمەنی لـە کوردسـتان و ناچاربوونی خەڵک بە برینەوە و لووسـکردنی "دارسـتانەکان": کـە رۆڵی دیار و بەرچـاو لـە خاوێـن راگرتنـی ژینگە و تەندروسـتیدا دەگێڕن.

(4) هۆکاری دروسـتیی جەسـتە: تەندروستی لەش لە رووی ئۆرگانییـەوە کاریگەرییەکی زۆری بەسـەر منداڵ بوونەوە هەیە و پشتگوێخستنی بە ئەنقەستی رژێم بۆ ئەم لایەنە پڕ بایەخ و زیندووە، شـێوە جینۆسایدێکە و لێرەدا بڵاوبوونەوەی نەخۆشـییەکانی (سـفلس) و (شێرپەنجە) و (گوێرەپانـە) و (سـیل و هەوکردنـی سـییەکان) دەبنە

هــۆی لــە نێوچوونــی ئەتەمەکانی هــەردوو جووتە گون کــە ناتوانن (ســپێرم) دروســتبکەن و ئــاکام دەبنە هۆی نەزۆکی[60]. دیارە ئەو نەخۆشــیانەش لە کوردستاندا بە بێ چارەســەر ماونەتەوە و هەر بۆ نموونە کەمی دەرمان و پزیشــکی پسپۆڕ و پێداویســتییەکانی چارە سەرکردن لە دامودەزگاکاندا و بێ ســەروبەربوونی نەخۆشــخانەی (ســیل) لــە هەولێر کە مرۆڤی لەشســاغی تێــدا نەخۆش دەبوو، بەڵگەیەکی قسەکانمانن.

(5) حاڵەتی شەڕ و دەرهاویشتەکانی: "جەنگ" یەکێکە لە هــۆکارە هەرە کاریگەرەکانی نەزۆک بوون. شــەڕ بەدەر لەوەی دەبێتە هۆی تێکچوون و تێکشــکاندنی شــیرازەی کۆمەڵایەتــی و ئابــووری کۆمــەڵ لە روانگــەی تەقاندنی چەکی جۆراوجۆری قورس و ســووکدا، کۆمەڵێک گازی ژەهــراوی دەردەکــەون کــە دوور و نزیــک کار دەکەنە ســەر ئــەم لایەنــەی کۆمەڵ، لێــرەدا کە رژێمــی بەعس، هەر دوای خۆســەپاندنی بەســەر گەلانی عێراقدا شەڕی کــوردی لــە 1968 /1970 و 1974 دا کــردووە و (8) ســاڵ شەڕی ئێرانی کردووە و کوێتی لە 1990 دا داگیر کردو گەورەترین شــەڕی نایــەوە و لە 1974 و 1975 دا بۆمبی ناپاڵم و فسفۆری بە کورد دا داوە و لە 1987 و 1988 دا گازی ژەهراوی و چەکی کیمیایی (ســیانید و خەردەل، ســارین، تاپۆن) ی بە کورد تاقیکردۆتەوە و بە

درێژایی 1974یش تـا دوای کۆچڕەوی 1991 جۆرەها تـۆپ و هـاوەن و میـن و تیی ئێن تی لە کوردسـتان بە کاریهێناوە و بە چەندین جۆر گازی ژەهراوی لێدەرچووە و بە خۆیان زانیبێت یان نەء؟ ئیفرازاتی ئەو شەڕانەی کە ئامازەیـان بۆ کـرا، لە ڕێگای ژینگە و دەوروبەر و ئاژەڵ و کشتوکاڵ و وەسـیلەکانی تری ژیان و گوزەران، کاتی یا بەردەوام بۆتە هۆی نەزۆک کردنیان[61].

ئەوانـە و زۆر حاڵەتـی تریش کـە پزیشـکەکان زیاتر تێیـدا پسـپۆڕن و بەو ئومیدەی کردنـەوەی ئەم دەرگایە هاندەرێـک بێت بۆیان بۆ لێتوژینەوە لە سـەر ئەم بابەتە زیندووە بە هەموو لایەنەکانیەوە.

(6) برسی کردن و بەدخۆراکی.

## پشکی پێنجەم :
## تێکشکاندنی منداڵ و ڕاگواستنی بۆ کۆمەڵێکی تر و جینۆساید کردنی کەلتووری

ئاشـکرایە کە منداڵ بـەردی بناغەی هـەر کۆمەڵێکە و هەر دەسـتدرێژی و ماف بەزاندنێک (نەخاسمە لە ڕووی ڕۆشـنفکرییەوە) کە لەمەیـان نەوە بەچەیەکـدا دەکرێتە سـەر کۆمەڵێـک، مانای تێکـدان و گۆڕیـن و ونکردن و نوغرۆکردنـی ئـەو وەچەیـە و ئاکام داڕمانـی هەیکەلی، بوونی ئەو کۆمەڵەیە.

دیارە ئـەوەش لە ڕێگای جینۆسـاید کردنی کەلتووری و ڕاپێچکردنـی منـداڵان بۆ کۆمەڵێکی جیـا و نامۆ و، بۆ خـاک و کـەش و هەوایەکی جیـاواز لـە ڕووی زمان و مێـژوو و خوونەریـت و ئەتمۆسـفێر و ئارکیۆلوجیـا

ئەنجامدەدریت. بە شـێوەیەک زمانی زگماکی خۆیان، کە ناسـنامەی نەتەوەییانە، لە بیردا رەش بێتەوە و مێشکیان بۆ کەلتوور و رۆشـنبیری و مێژوو و زانست و زانیاریی گشتی کۆمەڵە نوێیەکە زاخاو بدریت و لەسەر ئەو بنەڕەتە نەشـونما بکەن و لەسـەر رەوشت و ئۆل و بیروباوەڕ و لایەنی سۆسـیۆلۆژی ئەو کۆمەڵەش رابهێنرێن، لەو قاڵبە نامۆیانەدا تەرهیم بکرێن و بتاوێنرێنەوە !...

ئەگـەر ئـەم تاوانانە دەرهەق بە منداڵـی هەر میللەت و کۆمەڵگایـەک کـران، بێ ئەوەی بـاری دەروونی و ژیان و گوزەرانیـان خـراپ بێـت و بێ ئـەوەی توندوتیژی و هەڵسـوکەوت و مامەڵەی خراپیـان دەگەڵدا بکریت:(تەنها راگواسـتن بۆ کۆمەڵێکی دیکە بەڕێز و حورمەتەوە) ئەوا بـە جینۆسـایدی کەلتووری حسـێبە و ئەگەر سـەربار، لـە ئازار و ئەشـکەنجەدان و باری بژێـوی و گوزەرانی خراپیشـدا ژیان ئەوا (جینۆسـایدی جەستەیی)یشی دێتە سەر و دەبێتە دوو تاوان[62]. رێککەوتننامەی لە نێوبردنی جینۆساید و سزادان لە سەری، کە بەرەنجامی تاوانەکانی شەڕی دووهەمە، لە بەندی (2/ ه) دا ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بە جینۆسایدکردنی کەلتووری کردووە و بەس.

بەڵام لە بەرئەوەی کە رژێم 'جینۆسـایدکردنی جەستە' یشـی دەرهەق بە منداڵ ئەنجامداوە، بەپێی بەندی (16) لـە هەمان رێککەوتننامـەدا کە رێگای بـە دەوڵەتە لایەنە

واژووکارەکانی داوە، لە هەروەختێکدا داوای بژاردەکردنی ڕێککەوتننامەکە بکەن، وا پێویستدەکات کە چەند دەوڵەتێک پێشـنیاری زیادکردنی سزای جینۆسایدکردنی جەستەیی منداڵ بکەن و وابکەن کە بەڕاشـکاوی ماهییەت و سزای جینۆسـایدی کەلتووریـش تێیدا ڕوشـنبکرێتەوە، چونکە ڕژێم داهێنانـی لە ئەنجامدانـی هەردووکیاندا کردووە و بـەڕای ئێمەوە مادامەکی ئارمانجی گواسـتنەوەی منداڵی کورد بۆ ناوەراسـت و باشـووری عێراق بە مەبەستی لە نێوبردنی زمان و کەلتوور و مێژوو و لایەنی کۆمەڵایەتی کـوردە، ئـەو حاڵەتە بـە غەیـری ڕاگواسـتنیش هەر لە چوارچێـوەی کوردسـتاندا ئەنجامـدراو و لێـرەدا وای دەبینین جینۆسـایدکردنی کەلتووری و لەشیی زارۆڵە، بە ڕاگواسـتن و لە بنەجێ نشینیشـدا هەر جێبەجێ بووە و گرینگ (هاتنەدیی ئەنجامەکەیشە).

ئەوەی ڕاسـتی بێت ڕژێـم قەتاوقەت منداڵی کوردی بۆ ناوەراسـت و باشـووری عێـراق بە ڕێـز و حورمەتەوە نەگواسـتۆتەوە، بەڵکـو لـە دوای سـاڵی 1975 پـاش ئەوەی کە تەرحیل و ڕاپێچکردنی بە شـێوەیەکی بەربڵاو دەسـتپێکرد و تـا سـاڵی 1978 لەنێـوان 150-300 هـەزار کەس بـەرەو سـنوورەکانی ئەردەن و سـعودیە و بیابانـی ڕومـادی و ناوچەکانـی دیکـەی باشـوورو ناوەڕاسـت ڕاگوێزران، بەهەزاران منداڵیان لەگەڵ دابوو

که ســـەرەڕای ئازار و ئەشکەنجەدان و برسیکردنیان لەو قوتابخانانـــەی ئەوێـدا فێری زبانی عەرەبـی و ئەدەب و مێـژووی شـێوێنراوی عەرەب دەکـران، هەوڵی ئەوەیان لەگەڵ درا کە پەروەردەیەکی بەعســیانە بکرێن و فشارو ئەتمۆسـفێری ئـەوی ناچـاری فڕێدانی جلـی کوردی و لەبەرکردنی دشداشـــەی کردن و بەزۆر لەسەر عورف و عادەت و کەش و هەوای بیابانی گەرم و نامۆ راهێنران!..
ئـەو منداڵانەش کە لەوێ لەدایک بوون ڕەوشـــەکە وابوو کـە ناوی عارەبیـان لێبنرێت. لەنیســـانی 1980 بەدواوە، کـە نزیکەی 120 هەزار کورد لەفەیلییەکان لەژێر زەبرو زەنگدا بەرەو ئێران دەرپەڕێنران، رژێم بەسەدان کوڕپەو منداڵـی تازە لەدایکبوویان بۆ ئەم مەبەســـتە گل دایەوە و بەهەزاران منداڵ و مێرمنداڵیش لەودیوی ئێراندا بەخۆیان زانـی بێت یـان نەء، لەزمـان و کەلتـوور و خوونەریتی میللەتی فارســـدا توانەوە. کەدیـارە رژێمی بەغدا لەوەش بەرپرســیارە و لـەوەدا دوو تاوانی کـردووە، یەکەمیان: جینۆسایدکردنە کەلتوورییە، ئەوەی دیکەیان لێکترازاندن و لێک هەڵوەشاندنەوەی خێزانە (کە لەشوێنی دیکەی ئەم باســەدا ئاماژەمان پێکـردووە) و بەندی 1/10 لەپەیمانی نێودەوڵەتــی تایبــەت بەمافــە ئابــووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییــەکان، پاراســتن و یارمەتیدانــی خێزان، وەک یەکەیەکـی جەماعی و سروشـتی و بنەڕەتــی لە کۆمەڵدا

پێویســت دەکا، هەروەهــا بەنــدی 1/23 لەپەیمانــی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافی پاراستنی منداڵ بەو سیفەتەی کە ناکامڵە، بەبێ هیچ جیاوازییەک لەســەر خێزانەکەی و کۆمەڵ و دەوڵەت پێویســت کردووە، جگە لەبەندی 11ی دەستووری کاتی عێراق کە دەڵێ:(خێزان کرۆکی کۆمەڵە، دەوڵەت زامنی پشــتگیری و پاراستنی دەکات). کەهەموو بەنــدەکان ئاشــکراو مەفهومن و پێدڤی شــرۆڤەکردنیان ناکات.

لەســەر ئاســتی ناوخۆی کوردســتان، واتــە لەحاڵەتی بنەجێ نشــینیدا رژێم ئەو سیاســەتە پرۆگرامرێژەی هەر پیادەکــردووە و لەماوەیەکــی زۆر کورتــدا نەبووبێــت، پرۆگرامــی قوتابخانــەی مندالانــی کورد هــەر بەعارەبی بــووە، ناواخنــی زۆربــەی ئــەو پرۆگرامانــەش دەربڕی بڕیارەکانی کۆنگرەی حزبی بەعس بووە و باسی لەزمان و مێژوو و کەلەپوورو جوگرافیای خەڵکی دیکە کردووە، بەتایبەتی لەدەرســەکانی ئەدەب و مێژوو و پەروەردەی کۆمەلایەتــی و جوگرافیاو (ســەقافەی قەومی) کە ئەوەی دوابیان راپۆرتی سیاسی خودی حزبی بەعس بووە.

پرۆگرامی پۆلەکانی ســەرەتایی، بــە تایبەتی پۆلەکانی بەرایــی لەو قۆناغەدا بیرکردنەوە و کەش و هەوای ژیان و گوزەرانــی عارەبی تێدا رەنگ دەدایەوە و ئەو وێنانەی کە بۆ روونکردنەوە و تێگەیشــتن تێیان بلاوکرابوونەوە،

زۆربەیان بە جل و بەرگی میللی عارەبی بوون. بەهەرحاڵ پرۆگرامەکــە لەگــەڵ دەوڵەتانی کەنــداودا یەکگرتوو بوو و بــە زۆر و زوڵم بەســەر هزر و بیــری منداڵی کورددا دەسەپێنرا، ئەوەش بۆ تاواندنەوە و چاندنی گیانی رەگەز پەرســتی و شــۆڤێنیاتی، کە رژێم بەو سیاســەتەی ناوی نەتەوەی عارەبیشی شێواو و لەکەدار کرد.

ناوی قوتابخانەکان زۆربەی زۆری عارەبی بوون وەک (حســن بن هیثــم)و (ام ایمن) و (البكر) و (الادریســی) و (معاذ بن جبل) و (قادسیة) و (قعقاع) و (خالد بن ولید) و (میسلون) و (الاندلس) .... هتد[63].

لــە گۆرەپانــی ئــەو قوتابخانانەدا چەنــد کاتێکی وانەی یەکەم، بۆ تەقاندنی کلاشینکۆف و فێرکردن و گوتنەوەی سروودی بەعس تەرخان کرابوو و لە جیاتی (ئەی رەقیب) و (خوایە وەتەن ئاواکەی) و (چەند شیرینە لام داروبەردی وەتەنــم) دەبوایــە هەموو بەیەکەوە (وطــن مد علی الافق جناحــا...) بڵێنــەوە. بە نــاوی (طلائع) و (الفتوة) شــەوە، رژێــم زارۆکــی کوردانی بە بیروباوەڕی شۆڤێنســتانەی بەعــس تەڵقین دەدا و بەدەیان هەزار پارچە جلکی بەزۆر بەســەر منداڵاندا دابەش دەکرد کە رەســمی دارخورما و نەخشەی نیشتمانی عارەبییانی بە سەرەوە بوو و دەبوایە لەبــەری بکەن و بە پێچەوانەوە ئەگەر لە پیل و لینگانیان هەڵنەکێشــابا ئەوا بێشــک بە (مخرب) لــە قەڵەمدەدران و

سەرەڕای منداڵەکە خۆی و خاو و خێزانیشی بە سەرەوە ئیبادە دەکرا.

منداڵی کورد گۆڤاری تایبەت بە زمان و کەلتووری خۆی نەبوو و بۆ ئەوە دەبوایە گۆڤارەکانی (مجلتی) و (مزمار) بخوێنێتەوە کە بە زمانی عارەبی دەردەچوون و زۆربەی ناوەڕۆکەکانیان لەسەر بەعس و شەڕەکانی (القادسیه) و پێداهەڵگوتن بە سەدام بوو. ئەوە لە کاتێکدا (جاڕنامەی مافەکانی منداڵ 1959/11/20) کە لە دیباچەیەک و (10) بنەما پێکهاتووە، پاراستنی هەموو لایەنەکانی ژیانی منداڵ و مافەکانی لە هەموو هەلومەرجێکدا پێویست کردووە، بە بێ جیاوازی نەخاسمە لەرووی فێربوون و بەرزکردنەوەی رادەی رۆشنبیری گشتی (بنەمای 7) هەروەسا لە رێگای یاسا و وەسیلەکانی ترەوە بوار و ئاسانکاریی پێویستی پێ ببەخشرێ بۆ نەشونماکردنێکی سروشتیی و دروستیی لەش و ئاوەز و لایەنی رۆحی و سۆسیۆلۆژی لە کەش و هەوایەکی شکۆمەند و ئازاددا (بنەمای 2).

لەبەر بایەخ و بەهای ئالی کەلتووری (بەمەفهومە فراوانەکەی) و رۆڵی لە ناساندن و ناسینەوەی گەلاندا (وەک پێناسەیەک) جاڕنامەی بنەماکانی ئالیکاریی کەلتووری نێودەوڵەتی کە لە 1966/11/4 دا دەرچووە، لە بەندی (1/1) دا بە روونی دەڵێت: هەموو کەلتوورێک

بەهـا و كەرامەتی هەیە و پێویسـتە ڕێزیـان لێبگیرێت و بپارێزرێن.
لە (2/1) یشـدا لـە هەمان جاڕنامە، ئەشـونما پێكردنی كەلتـووری تایبەتی هەر گەلێـك، بە ماف و ئەركی ئەوی دادەنێت، لەوەدا ڕژێم كە سیاسەتی جینۆسایدی كەلتووری كـوردی لەمیان منداڵدا پەیڕەوكرد، لە هەوڵی پێكانی دوو ئارمانجدا بووە، یەكەمیان دروستكردنی وەچەیەكی مێشك نەخـۆش و لە میللـەت هەڵگەڕاو یا دابڕاو، دووهەمیان لە نێوبردنی خودی كەلتوورە ڕەسـەنەكە بەواتا مانەویەكە.
وەك پێشـتر پەنجەنماییمـان كـرد، ڕژێم هـەر بەوەندە نەوەستا، بەڵكو جینۆسایدی جەستەیی منداڵی كوردیشی كـردووە و ئـازار و ئەشـكەنجەی داوە و شـوێن بزر و ئەنفالی كردووە و لە بەندیخانە و ئۆردوگا زۆرە ملێكانی پەسـتووە و تەهجیـری كردووە، هەروا لـە گۆترە و بێ دادگایـی و لـە دەرەوەی هەمـوو عورف و یاسـاییێك لە سێدارەدانی كردوو.
ڕێكخراوی لێبوردنی گشـتی (ئەمنسـتی ئەنترناشـنال) یەكێكـە لـەم ڕێكخـراوە كارا و ماندوو و ڕاسـتگۆیانەی كـە لـە ڕاپۆرتـی مانگـی ئـازاری 1989 یـدا، تەئكیدی لـەوە كردۆتەوە كە: (لـە زیندانەكانی عێراقیـدا مامەڵەی وەحشـییانەی منـداڵان بۆتە ممارەسـەیەكی ڕۆتینی....، تەنانەت منداڵانیش هەڵسوكەوتی خراپیان دەگەڵدا دەكرێت

بـۆ ناچارکردنی ئەندامانی خانەوادەکانیان بە دان پێدانان بەتاوانی سیاسـی مەزعوم ..)[64]. بـەو رەنگە منداڵانیش وەبەر هەمان شـاڵاوی قەتـڵ و عام کەوتن. لە 1982 دا (ئامادەیی کوردسـتان) لە هەولێر بە دەستی خودی رژێم تەقێنرایـەوە بـە دەیـان قوتابی شـەهید و بریندار بوون یـان ئەوەتا قوتابیانیان لە نێو قوتابخانەدا راپێچ کردوون یاخود رێزیـان کردوون و هەموویان بەیەکەوە شـەهید کردوون[65].

لە سـاڵی 1983 دا کاتێک کە بارزانییەکان شـوێن بزر و ئەنفـال و ئیبـادە کران، (315) منداڵیـان دەگەڵدا بووە قوربانی، ئەو حەقیقەتەش ئەمنستی ئەنتەرناشنال تۆماری کردووە و ناوی هێندێکیانیشی زانیوە لەوانە (احسان علی شـهاب / ساڵی لە دایکبوون 1974 / بارزان لە قوشتەپە و لە تەمەنی 9 سـاڵیدا گیرا، فرهاد یحیی/ 1973 شوێنی گرتنی هەریر، سید سلمان حاجی/ 1972 هاسناکا شوینی گرتن قوشـتەپە، یاسین محمد یاسـین/ 1971 سیفیل – شـوێنی گرتن قوشتەپە. مالا علي ابراهیم 1970 پێندرو- شوێنی گرتن دیانا، عزیز میرخان حامد/ 1969 کانیا دەر - شـوێنی گرتن دیانا. فرهـاد ابراهیم باپیر / کانی بۆت- شـوێنی گرتن دیانا لە تەمەنی 15 ساڵیدا. مولود شیشەر مولود /1968 بەخشـاش / گرتن لە تەمەنی 16 سـاڵیدا، صبری حازم محمود/ 1967 بەرسـیاف / شوینی گرتن،

هەرير لە تەمەنی 17 ساڵیدا[66].
منداڵە فەیلییەکانیش لە 1980 و 1981 بەدواوە بە هەمان دەرد بران و نموونەی ئەمەش قوتابییەکە بە ناوی (مالک بابە ئەسفەندیار کە لە 1983/4/10 و لە تەمەنی 16 ساڵیدا لە یەکێک لە شەقامەکانی بەغدا بەرەو شوێنێکی نادیار پێل بەست کرا![67].
لە ئەیلوول و تشرینی یەکەمی 1985 دا ئەمنی سلێمانی 300 منداڵ و مێرمنداڵی تەمەن لە نێوان (10-14) ساڵاندا، رەشبگیر کرد بە تۆمەتی ئەوەی کە کەس و کاریان (پێشمەرگەی مقاوەمەتی ئیبادەکردنن)، لە زیندانەکاندا کەوتنە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدان، ئەوەش پێچەوانەی بەندی (7) لە پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکانە کە ئازار و ئەشکەنجەدانی قەدەغە کردووە. هەروەها بەندی (383) لە یاسای سزادانی عێراقی (ژمارە 111 ساڵی 1969) بەسەر خودی رژێمدا پیادە دەبێ بەوەی کە بەندکردن بۆ ماوەیەک کە لە (3) ساڵ زیاتر نەبێت یا پێ بژاردن کە لە (300) دینار زیاتر نەبێت، بەسەر هەر کەسێکدا دەسەپێنێ کە ژیانی کەسێک بخاتە مەترسییەوە، نەگەیشتبێتە 15 ساڵ. دیارە یاسا لەلای رژێم لەو لاپەڕە رەشکردنەوە زیاتر نییە.
لە 1987/1/15 دا رژێم تیلاکی لە (70) منداڵ و مێرمنداڵ لە کۆی ئەو (300) کەسە خوار کرد و بێ

پەروابییانــە لە ســێدارەدانی کردن و بۆ ئیهانە و شــەڕی دەروونی و ســووکایەتی پێکــردن و دەمار گرتن، داوای خەرجیــی لــە ســێدارەدانکردن و تەســلیم کردنــەوەی تەرمەکانیشــی لــە خانەوادەکانیــان کرد بە بــڕی (300) دینار بۆ هــەر یەکێکیان کە دیارە بڕی پارەی ناوبراو بۆ ئەو کاتە (1987) مووچەی (4) کارمەندی دەوڵەت بووە و دیناری عێراقی بەهایەکی ئابووریی بەرزی هەبووە. لە ئابــی 1988 دا 353 کــەس لە ناوچــەی ئامێدی/ دهۆک دا گیــران کــە لەنێوانیانــدا 52 منداڵی تەمــەن 11 تا 17 ســاڵی تێدا بووە و لە ئەیلوولی هەمان ســاڵدا شوێن بزر کران[68].

لــە نێوان تشــرینی یەکەمی 1988 و تشــرینی یەکەمی 1989 دا، 433 منداڵی عێراقی کە رەنگبێ رێژەیەکی چاکی منداڵــە کوردی فەیلییان لەگەڵــدا بووبن، بە تەنێ و لەژێر بارودۆخێکی سەخت و دژواردا بەرەو ئێران راگوازێزران و لەوێشدا پشتگوێ خران و بایەخێکی ئەوتۆیان پێنەدرا، منداڵ شــیر نەبــووە بیخــواو داوودەرمــان و چاودێری پزیشــکی لاواز بووە و ئەمەش بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی چەندین نەخۆشــی بەرفراوانی وەک (ســیل) و (مەلاریا و کۆلێرا و نەخۆشییەکانی پێست) لە نێویاندا[69].

ئــەوە لە کاتێکــدا هەمــوو رێککەوتننامــە و جاڕنامە و دەســتوور و یاســاکانی دەرەوە و عێراقــی پــێ لەســەر

پارێزگاریکردنی منداڵ دادەگرن، نەمازە (جاڕنامەی تایبەت بە پاراستنی ئافرەت و منداڵ لە کاتە نا ئاساییەکان و ناکۆکی شەڕی چەکداری، 1974/12/14) و لە روانگەی ئەم جاڕنامەیەوە ئەگەر دەستدرێژی بۆ سەر منداڵ لە کات و ساتی شەڕدا تاوان و قەدەغە بێت ئەوا لە کاتی ئاشتیدا تاوانێکی مەزنترە و لەوەدا رژێم چ لە کاتی شەڕ و چ لە کاتی ئاشتیدا نەخشەی جینۆسایدکردنی منداڵی کوردی داڕشتووە و پیادەی کردووە.

بنەمای (5) لە جاڕنامەی ناوبراو هەموو شێوەکانی تێکشکاندن و مامەڵەی توند و تیژ و نامرۆڤانە لە دژی ئافرەت و (منداڵ)دا بە کاری ئیجرامی و تاوان دادەنێ، لەوانە ئەشکەنجەدان و لە سێدارەدان و دەسرێژی گوللە و گرتنی بە کۆمەڵ و سزای بە کۆمەڵ و وێرانکردنی خانوو و دەرپەڕاندن، کە دەوڵەتە شەڕکەرەکان لە کاتی عەمەلیاتی عەسکەریدا یا لە هەرێمە داگیرکراوەکاندا ئەنجامیدەدەن.

## پەراوێزەکانی پاری دووهەم

(1) بڕوانــە: د.حســنین ابراهیــم صالح عبیــد، الجریمــة الدولیة، ل 264.

(2) بــۆ ڕێروونی زیاتــر بڕوانە: (حقوق الانســان) بڵاوکراوەیەکی ناوەنــاوەی لیژنــەی داکۆکــی کارە لــە مافەکانی مرۆڤ لــە عێراقدا. ڕێپۆرتــی (پێشــێلکارییەکانی ڕژێمی عێراقی بــۆ مافەکانی مرۆڤ لە عێــراق، لــە ڕاپۆرتــی ڕێکخراوەکاندا) ژمــارە (1)، کانونــی یەکەمی 1988، ل4. هەروەهــا بۆهەمان مەبەســت بڕوانە (حقوق الانســان)، لــە پێنــاوی بەدواهێنانی ئیرهاب و تێکشــکاندن لە عێراقدا، با فشــار بەردەوام بێت) ژمارە (3)، نیسانی 1989، ل6.

(3) (حقــوق الانســان)، ڕێکخــراوی عارەبــی بۆمافەکانــی مرۆڤ، پێشــێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە عێراق ڕیســوا دەکات، ژمارە 21، حوزەیرانی 1992 ل11.

(4) (حقــوق الانســان)، ئەمنســتی ئەنترناشــنال بە ژمــارە ژێر پێ خســتنەکانی ڕژێمی عێراقی بۆ مافی مرۆڤ ڕیسوا دەکات، ژمارە 1، 1988، ل12.

(5) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل11.

(6) لیژنەی مافی مرۆڤ، خولی چل و هەشتەمین، ڕاپۆرتی ڕێزدار ماکس ڤان دیر شتۆئیل لەسەر باری مافی مرۆڤ لە عێراق، 1992، ل41.

(7) لیژنــەی داکۆکیکــردن لە مافەکانی مرۆڤ لە عێراق، (الســموم

وســيله من وسائل تصفية الخصوم السياســيين في العراق)، 1992، دمشق، ل47.

(8) بروانه: غرين روبرتس، (شــهادة بريطانية)، گۆڤارى دراســات كردية، ژماره 4-8، پاريس1993،ل101، هەروەســا بروانه: (حقوق الانســان): چەند شايەدێكى زيندوو پێشــێلكردنى مافەكانى مرۆڤ له عێراقدا ڕیسوادەكا، ژماره 6، تشرينى يەكەمى 1989، ل11.

(9) چەند شــايەد عەيانێک تەئكيدى ئــەو واقعەيان كردەوە و هەر بۆ ئەم مەبەســتە لــە دواى ڕاپەڕینى 1991، پێشــانگاى هونەرى و فۆتۆگرافی له شارى هەولێر ڕێكخرا .

(10) (حقوق الانسان) له پێناوى به دواهێنانى ئيرهاب و تێكشكاندن له عێراقدا با گوشار بەردەوام بێت، ژماره (3) نيسانى 1989، ل5.

(11) زنجيرەى شــالاوى جيهانى بۆ مافي مرۆڤ، القانون الانساني الدولي و حقوق الانسان، جنيڤ 1992، ل ل25 ،26.

(12) هەمان ســەرچاوە، ل21 . هەروا : د. حســنين ابراهيم صالح، ل237.

(13) د. حسنين ابراهيم سالح، ل ل 238 و 87.

(14) (حقوق الانســان)، انتاج...اســتخدام. تخزين الاسلحة الكيمائية، انتهاک صارخ لحقوق الانسان، ژماره (3)، 1989، ل10.

(15) د. حسنين ابراهيم صالح، ژێدەرى پێشووتر، ل236 .

(16) ڕۆژنامــەى (خەبات) زمانحالــى (پ.د.ک.ع) بەعارەبى، ژماره 785، 1996/4/19، هەروەهــا؛ كنعــان مكيــة، القســوة والصمــت، منشورات هيئه الارسال العراقية، هەولێر 1996، ل 170.

(17) ڕۆژنامەى (خەبات) هەمان سەرچاوە، ڕۆژى 1996/4/19.

(18) نمونەى ئەو ڕۆژنامه و ئاژانســانەى كه له دواى ژەهرباراني هەڵەبجــه و ئەنفالەكان، لەســەر كارەســات و ئيبادەكردنى كورديان نووســى: (فاينێنشاڵ تايمز، هيراڵد تريبيون، تايمز، هارانكى قوبرسى، ئۆبزەرڤەر، نيويۆرک تايمز، ئاژانسى ڕۆيتەر، ئاژانسى ڕۆژنامەوانى

فەرەنسی، گۆڤاری یو ئێس ئێس ئەی، ریپۆرتی ئەمریکایی، ...هتد) بوون کە بژاردەکانیان لە ژمارەکانی 3و6و7و8 ی(حقوق الانسان) 1989-1990دا بلاوکراونەتەوە.

(19) (حقوق الانسان)، انتاج.. استخدام. تخزين الاسلحة الكيماوية، انتهاک صارخ لحقوق الانسان، ژمارە (3) نیسانی 1989، ل12.

(20) (حقوق الانسان) المنظمة العالمية للعاملين في الصحة وحقوق الأنسان، تفضح انتهاكات النظام العراقي لحقوق الانسان، ژمارە (5)، 1989،ل13.

(21) كنعان مكية، القسوة والصمت، ل ل 165 ،166.

(22) هەمان سەرچاوە، ل 167.

(23) هەمان سەرچاوە، ل172، هەروەسا: لیژنەی مافي مرۆڤ، راپۆرتەکەی ماکس ڤان دیر شتوئیل 1992، ل78.

(24) كنعان مكية، سەرچاوەی پێشوو، ل 173 .

(25) راپۆرتی ڕێزدار دێرشتوئیل 1992، ل ل 56، 81.

(26) بۆ ئەم دەقە و زانیاری پتر بگەڕێوە : كنعان مكية، ل173.

(27) لجنه الدفاع عن حقوق الانسان، شهادات تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق، دمشق، 1990، ل 23 هەر بۆ ئەم مەبەستە و بۆ قووڵبوونەوە لە ماهییەتی ئەو کارەساتە گەورەیە شایەدنامەکەی (رەمەزان محمد)ی تەمەن 19 ساڵەی خەڵکی مانگێش بخوێنەوە بۆت دەردەکەوێت کە ئیبادەکردنەکەی (گەلی بازێ)ش هیچی کەمتر نییە لە جینۆسایدەکەی (هەڵەبجە)، بۆ ئەمە بڕوانە: غوين روبرترتس، شهادة بريطانية، دراسات كردية، ژمارە (4)،ل ل 100، 101.

(28) (حقوق الانسان)، ژمارە (2)، شوباتی 1989، ل 15.

(29) لجنة الدفاع عن حقوق الانسان، شهادات تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق (شایەدنامەی هاوولاتی ئەنوەر محەمەد)، ل ل 28،29.

(30) (حقوق الانسان)، شایەدنامەی هاولاتی (حسن موسى حسن)،

ژماره (12) کانونی یەکەمی 1990، لاپەڕەکانی 8و9و10.

(31) بگەڕێوە: (حقوق الانســـان) و المقابــر الجماعیة، ژماره (24)، کانونی یەکەمی 1992ل ل 8و9، هەروەها بۆ هەمان مەبەست و پتر زانیاری بنۆڕە: هەمان سەرچاوە، حالة حقوق الانسان في العراق في تقریــر الخارجیــة الامریکیة في عام 1993، ژمــاره (40) تەمموزی 1994، ل13.

(32) ئەوەتــا ســـەرۆکی ڕژێــم خۆی بە ئاشــکرا ســـووکایەتی بە قانوون دەکا و لە بۆنە و دانیشــتنێکی ســـاڵی 1981 ی تەلەفزیۆنیدا دەڵێ: (قانون تەنها وەرەقەیەکە و ئێمە دێڕێک یا دوو دێڕی لەســـەر دەنووســـین و پاشـــان لە ژێریەوە بەناوی ســـەدام حسێن، سەرۆکی کۆمــارەوە ئیمزای دەکەین) بۆ ئەمە بڕوانە (حقوق الانســـان) ژماره (3)، 1989، ل 6.

(33) شکری صالح زکي، مشروع لائحة اتهام صدام حسین وارکان النظام العراقي، حقوق الانســـان ژماره 32، تشرینی دووەمی 1993، ل 6.

(34) (حقوق الانســـان)، منظمة العفو الدولیة، الاطفال ضحایا بریئة للقمع السیاسي في العراق، کانونی دووەمی 1989، ل5.

(35) بڕوانە: شــکري صالح زکي، وتار و ســـەرچاوەی پێشــووتر، ژماره (37)، نیسانی 1994ل 6و7 هەروەها ژماره(38)،ل6.

(36) من خۆم یەکێکم لەو شایەدانەی کە لە دوای 1975ەوە لەگەڵ خانەوادەکەمــدا ئــەو حاڵەتانەم بینیوە و لەگەڵیــدا ژیاوم و موعاناتم پێــەوە کردووە. تا ئەو کاتەی تەرحیــل کراین هەر درێژەی هەبوو، نووسینەوەی ئەو فەترەیە بواری باس و بابەتی تری سەربەخۆیە و لێرە جێی نابێتەوە.

(37) بــۆ زیاتــر ڕوون بوونـــەوە و زانیاریــی دەربـــارەی تەواوی کارەساتی ئەنفالەکە بڕوانە: کنعان مکیة، لەلاپەرە 188تا ل210.

(38) و (39) خانەوادەکەی ئێمە، ج وەک شایەد و ج وەک قوربانی،

لــه هەردووحاڵەتدا ژیــاو قۆناغی یەكەم یەک لەئەندامانی ئەساســی خێزانەكە، بەدەست بەسەری بۆ گوند و شارەكانی جنوب دوورخرایەوە و لەزیندانەكانــی (ئەمنــی عامە) ئاخنرا وقۆناغــی دووەمیش تێكدانی خانووبەرەو مومتەلەكاتی تر و لە دواییشــدا تەرحیل و راگواستنمان بوو....

(40) كنعان مكية، القسوة والصمت، ل164و165.

(41) (حقوق الانســان)، مذكرة الى الامين العام للامم المتحدة حول جرائــم صدام حســين والمســؤولين الكبار فــي العراق، ژمــارە 23، تشرینی یەكەمی 1992، ل7.

(42) بڕوانە : (حقوق الانسان)، ژمارە (6)، تشرینی یەكەمی 1989، ل8.

(43) میــن ڕێژیــی خاڵێكی گرنگــی پلان و نەخشــەی ئیبادەكردن بووە. ئەوەتا تاهەنووكەیش (1996) سەرەڕای هەوڵ وچالاكییەكانی ڕێكخــراویMAG تایبــەت بە میــن دەرهێنان و هەوڵی تاقەكەســی خەڵک و هۆشــداركردنەوەی خەڵک بەهــۆی بوارەكانی ڕاگەیاندنەوە لــە میــن، كەچــی ڕۆژانە چەندیــن شــەهید و بریندار و ســەقەت و پەككەوتەدەبن...

(44) لیژنــەی نێودەوڵەتی مافی مرۆڤ، ڕاپۆرتەكەی مســتەر دێر شتوێل 1992، ل79.

(45) بۆ ژمارەكان بگەڕێوە هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل 78و85

.

(46) ئــۆردوگای زیندانــی قوشــتەپە، یەكێک بــوو لەوانەی كە بێ ئاوبــوون و ژن و منــداڵ بە ئازار و زەحمەتێكــی زۆرەوە تەنەكەی قۆپاویان لەســەر شان و ســەر دادەنا و لە شوێنی زۆر دوورئاویان دەهێنــا، كەچی كاتێک كە نزیــک ماڵەكانیان دەبوونــەوە، لەگەرمەی هەنكەهەنكیــان دا ئەمــن و موخابەراتی بــارزان تكریتی و یەكەكانی (جەیــش!) نیشــانەیان لە تەنەكــەكان دەپێكا و بــەر گوللەیان دەدا و

غەیــرەز بڵاوکردنــەوەی تــرس و لــەرز و تۆقانــدن، ئاوەکانیان لێ دەڕشتن؛ بۆ پتر زانیاری بڕوانە: کنعان مکیە، ل 166.

(47) د. محمود عثمان، الاکراد في العراق، دراســات کردیة، ژمارە 4، 1963،ل 62. ئەوەبوو ڕژێم ئەو (بڕیار!)ەشی جێبەجێ کرد و بۆ ئەمە بڕوانە ئەو بەڵگەنامانەی کەلە (پاشبەند) دا بڵاوکراونەتەوە.

(48) د.محمد الهماوندي، فکرة قانونیة لفکرة الحکم الذاتي وتطبیقها في کوردستان العراق، دراسات کردیة، ژمارە(3)، 1992، ل28.

(49) عبدالحسین شعبان، القانون الدولي وقضیة المهجرین العراقیین، حقوق الانسان، ژمارە 16ی ئابی 1991، ل ل10، 11.

(50) بۆ دەقی بروســکەی ناوبراو، بڕوانــە: لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق. قرارات تفضح انتهاکات حقوق الانسان في العراق. شوباتی 1993،ل26.

(51) جینی شــربي، حملات التهجیر الجماعیة المنســیة في العراق، (شهادات) حقوق الانسان، ژمارە(25) ساڵی 1993،ل19.

(52) الدکتور غالب علي الداودي، القانون الدولي الخاص، (الجنسیة والمرکز القانوني للاجانب واحکامها في القانون العراقي)، وزارة التعلیم العالي (العراق )، 1981-1982، ل25 بەدواوە.

(53) بڕوانە: لجنة الدفاع عن حقوق الانســان في العراق، شــهادات تفضــح انتهــاکات حقــوق الانســان فــي العــراق، دمشــق 1990. ل 7بەدواوە.

(54) لەســەر ئەوە؛ یەکێک لــەو ئافرەتانەی کە نێوی لەیلا بووە و ڕژێــم گرتبووی و گلی دابــوەوە و بەپێی بڕیاری (عافوات!) بەرەڵای کردبــوو، لەو ئانەدا بە دەســەڵاتدارانی ڕژێم دەڵــێ: تەرحیلم بکەن، وەک ئەوەی کەسوکارمتان تەرحیل کرد. ئەوانیش دوای چاوخشاندن بەدۆسیەی خانەوادەکەی لەیلا، پێی دەڵێن: ئەڕاگوێزان و ئەسەفەریش دەکەیــت. پاشــان بــۆی ڕوون دەکەنــەوە و دەڵێــن: خانەوادەکــەت بەتەواوی عێراقییە، بەڵام لە ژێر ئەو بەندەدا (خانەوادەی نامەرغوب)

بۆ ئێران تەهجیر کرا؛ لەدرێژەی ئەوەدا بڕوانە: حقوق الانسان، ژمارە 42تشرینی دووەمی 1994 . ل6 بەدواوە.

(55) بـۆ دەقـی یاداشـتنامەکە بڕوانـە: حقـوق الانسـان،ژمارە 24،ل15.

(56) د.عبدالوهاب حومد، دراسات معمقة في الفقه الجنائي المقارن، مطبوعات جامعة الكويت، 1983. ل286.

(57) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ل 286و 287.

(58) هەمان سەرچاوە،ل287.

(59) هەمان سەرچاوە، ل 288.

(60) د.وصفـي محمـد علـي، الطب العدلـي علما وتطبيقـا، مطبعة المعارف، طبعة خامسة الجزء الثاني، بغداد 1976، ل 66.

(61) سـناء الجـاک. هل لسـموم قذائف الحـروب دور في تناقض الخصوبة عند اللبنانيين؟، ڕۆژنامەی: الشـرق الاوسط، ژمارە 6446 لە 1996/7/22.

(62) د.حسنين ابراهيم صالح عبيد، الجريمة الدولية، ل265.

(63) د.محمـد الهماونـدي. قـراءة قانونيـة لفكرة الحكـم الذاتي .... دراسات كردية، ژمارە (3)/ساڵی1992، ل28.

(64) بڕوانە:(حقوق الانسـان) وقفة مع رسـالة الرئيس العراقي الى المؤتمر العالمي من اجل الطفل، ژمارە (12)، کانونی یەکەمی 1990،ل 2و3.

(65) "حقوق الانسـان" منظمة العفو الدوليـة؛ الاطفال ضحايا بريئة للقمع السياسـي في العراق، ژمارە(6)، تشـرینی یەکەمی 1989، ل ل 5و6.

(66) (حقوق الانسـان)، منظمة العفو الدولية/ الاطفال ضحايا بريئة للقمع السياسي في العراق، ژمارە (7)، کانونی یەکەمی 1989، ل7.

(67) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(68) "حقوق الانسان " العفو الدولية تفضح انتهاكات حقوق الانسان

في العراق، ژماره 16، ئابی 1991، ل13.

(69) "حقوق الانسان" تهجير الاطفال جريمة جديدة ترتكبها الحكومة العراقية، ژماره(7)، كانوونی یەكەمی 1989،ل16.

## نەخشە و شێواز و ئەنجامدەرانی جینۆساید

سـەرەتا هەر تاوانێکی بە ئەنقەست، بەر لە ئەنجامدانی، نەخشـەی بۆ دادەنرێ و لە چەند قۆناخێکی لە پێشـینەدا تێدەپەڕێـت و یەکەم پێنگاڤ پەیوەنـدی بە نییەت و نیاز و دیوی نـاوەوەی تاوانکارەوە هەیـە و بەوەی کە تەنها بیرکردنەوەیەکـی نـاخ و دەروونە و هەنـگاوی کردەیی بـۆ نەهاوێـژراوە و زەرەری بە هیچ کـەس و کۆمەڵێک نەگەیانـدووە و بواری پەژیـوان بوونەوە لە خودی هزر کردنەوەکەدا مشـەیە، لەبەر ئەوەیش کە سـەلماندنی ئەو حاڵەتـە بـۆ دادوەر خەیلـی گرانە، لە یاسـادا سـزای لە سەرنییە[1].

دوای بیر لێکردنەوە و پلان و رشــت بوون و هلۆڤانیی لەســەر ئەنجامدانی تاوانەکە (التفکیر و التصمیم) قۆناغی خۆ ئامادەکــردن (التحضیر) وەک رووکارێکی ماددیانەی دەرەوەی بیرکردنەوە و رشتبوون لە سەر تاوانەکە دێت، ئەو ئامادەکارییەش بریتییە لە دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەنجامدانــی تاوانەکە (وەک پەیداکردنی چەک)[2]. قوناغی ســێهەمیش بریتییــە لە دەســتپێکردن بــە جێبەجێکردنی تاوانەکە (البدء بتنفیذ الجریمة) و لێرەدا ئەگەر تاوانکار بە هۆی ئەو قۆناخانەی پێشــووی تاوانەکەی بەرەو کۆتایی برد ئەوا تاوانی کامڵ و بە ئەنجام گەیشــتووی (الجریمة التامــة) ی پــێ دەوتــرێ، وەک ئــەوەی یەکێــک بیەوێت کەســێکی تر بکوژێت، چەند گوللەیەکــی لێبداو لە ئاکامدا تاوان لێکراو بمرێت لەوەشدا دیارە هەردوو روکنی مادی (کار و پەیوەندی سەبەبی و نەتیجەی ئیجرامی) و مانەوی لە تاوانەکەدا فەراهەم بووە.

وەلــێ ئەگــەر بەهــەر هۆیەکــی دەرەوەی توانســت و ئیــرادەی تاوانکارەوە نەشــیا تاوانەکە بــە کۆتا بگەیەنێ ئەوا بە دەستپێک لە جێ بە جێ کردنی تاوان دەژمێررێ (شــروع) وەک لە نموونەی پێشوودا: کەسێک خوازیاری کوشــتنی کەســێک بێت و خۆی بۆ ئامادە بکات و دەست بە جێبەجێکردنی بکات، بەڵام نیشانە نەپێکێ یا بە شوێنی ترســناکی نەکەوێــت (جریمــة خائبة) یا کەســی ســێیەم

دەمانچەکـەی لە دەسـت دەربێنێ (جريمة موقوفة) و بەو ڕەنگە لە مردن ڕزگاری ببێت. بەو پێودانگە (شروع) بریتییە لـە ڕاپەڕاندنێکـی ناکاملێ تاوان و لەگـەڵ تاوانی کامڵ و ئاکامـداردا پێکەوە و وەک یەک لە قۆناخی دەسـتپێکردن بە ڕاپەڕاندنی تاوان دەسـتپێدەکەن بەڵام لە (شروع) هەر لـەو قۆناخدا دەمێنێتەوە و لە تاوانی کامڵدا، بە کۆتا دێت: بـە مانایەکی تر لە ئـەوەی دواییدا ڕوکنی ماددی هەموو ڕەگەزەکانی جێ بە جێ دەبن بەڵام لە (شروع) دا ڕەگەزی دوایی کە ئەتیجەی ئیجرامییە، (بەئەگەری بەدەر لە توانای تاوانکار) نایەتە دی[3].

هـەر لەو مەفهـووم و مانایەدا بەندی (30) لە یاسـای سزادانی عێراقی بەو شێوەیە ئاماژە و پێناسەی (الشروع)ی کـردووە بەوەی کـە: (دەسـتپێکی جێبەجێکردنی کارێکە بە مەبەسـتی ئەنجامدانی تاوانێک یا لاسـارێک (الجنحة) ئەگەر ئەنجامەکەی وەسـتێنرابێت یا هیوابڕاو بووبێت بە چەند هۆیەکی لە ئیرادەی کارکردەکە بە دەربێت).

لە بنەڕەت و ئەسڵدا، یەک کەس کە کارکردەی سەرەکی (الفاعـل الأصلـی) پێ دەگوتـرێ بە ئەنجامدانـی تاوانێک هەڵدەستێ و هەموو ڕەگەزەکانی ڕوکنی ماددی تاوانەکە جـێ بەجێ دەکا، بـەڵام ئەوە مەرج نییـە و لە زۆرباران دوو کـەس یـان زیاتر بە ئیـرادە و پێزانینـەوە، بەهۆی هەرەوەزگەلـی یا بەشـداری و پشـکداری جینایەتکاری

(المساهمة الجنائية) له رۆڵی سەرەکی و لاوەکیدا تاوانێک یـا زیاتـر ئەنجامدەدەن، لێـرەدا کە ئاماژە بە پشـکداری جینایەتـکاری دەکەیـن، پێدڤی کـە هـەردوو تەرزەکەی بخەینە روو :

(1) پشـکداریی ئەسـڵی (المسـاهمة الاصلية): بە مانای ئەوەی یەکێک بە تەنها رۆڵی سـەرەکی لە جێبەجێکردنی تاوانێکـدا بدینێ، بـەوەی هەموو ئـەو کارەی کە روکنی مـاددی تاوانەکـە پێکی دەهێنـێ ئەنجامبدات لـە حاڵێکدا ئەگەر روکنەکە لەیەک کار پێکهاتبوو، یان لە چەند کارێکی ماددی پێک هاتبوو، ئەوا هەمدیس خۆی جێ بەجێ بکات، یـا ئەگـەر لەگەڵ کەسـانی تـردا ئەو کارەی کـە روکنی ماددی تاوانێک پێکدەهێنێ ئەنجامیبدەن، ئەگەر ئەو روکنە لـە یەک کاری ماددی یا کۆمەڵـە کارێک پێکهاتبێ و هەر یەکێـک تەواوی روکنەکە یان بەشـێکی جێ بەجێ بکا و هەموویان رۆڵی سـەرەکیان لە تاوانەکەدا هەبوو بێت، بە پشـکداریی ئەسڵی حسـێبە (بەندی 1/47 و 2 لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە 111 ی ساڵی 1969)[4] .

لەوەشـدا جیـاوازی نییە لـەوەی کە تاوانەکـە کامڵ و ناکامدار، یان (شروع) بێت. هەروەها ئەگەر چەند کەسانێک هەرەوەزگەلیـی لـە نێوان خۆیاندا بکـەن و رێکبکەون لە پیادەکردن و بەجـێ گەیاندنی روکنی ماددی تاوانێک کە لە چەند کارێک پێکهاتبێ و هەر کەسە و کارێک یان زیاتر

راپەڕێنن. لەوەشدا ئەگەر تاوانەکە کامڵبێت یا "شروع" هەموو بەشداران بە پشکداری ئەسڵی و سەرەکی دادەنرێن (وەک بۆ نموونە: دوو کەس ڕێکبکەون هاوکاری یەکتر بکەن لە ڕفاندنی منداڵێک بەو مەرجەی یەکێک بیرفێنێ و ئەوەی تر بیشارێتەوە و شوێن بزری بکات.. )[5].

(2) پشکداری پاشکۆیی (المساهمة التبعية) لە تاوان: کە بریتییە لە (هەر چالاکییەک کە بە پەیوەندییەکی سەبەبییەوە بە کارە جینایەتییەکەو ئەنجامەکەی بەستراوەتەوە، بێ ئەوەی جێبەجێکردنی تاوانەکە یا ڕابوون بە ڕۆڵی سەرەکی لە ئەنجامدانی کەتنەکەدا بگرێتەوە)[6].

لەوەدا دەگەینە ئەوەی کە پشکداری پاشکۆیی خۆی لە خۆیدا، واتە پێش ئەوەی بە هیچ تاوانێکەوە ببەسترێتەوە (مباح)ەو لە ئەنجامدانی تاواندا ڕۆڵی ناڕاستەوخۆ و لاوەکی هەیە. ئەم شێوە پشکدارییە ڕۆڵی تەنفیزی نییە و لە کاری وا پێکهاتووە کە سیفەتی جینایەتییان لە لکان و پەیوەندییانەوە بە پشکداری ئەسڵییەوە وەرگرتووە. هەروەک ئەم پشکدارییە یا پێش ئەنجامدانی تاوانەکە دەبێت یاخود لە کاتی جێبەجێکردنیدا. لێرەدا پشکداری پاشکۆیی بەپێی ئەوەی کە بەندی (1/48 و 2 و 3) لە یاسای سزادانی عێراقی دیاریانی کردووە (تیخ تیخەدان و ڕێ بۆ خۆشکردنی) و (ڕێککەوتن) و (یارمەتیدان)ە.

لەوەی ڕابورد، ئەوە هەڵدێنجین کە ڕژێمی بەغدا

لەوەتەی حوکمی خۆی بە تایبەتی بە سەر گەلی کورد دا سەپاندووە، بە تایبەتی لە 1975ەوە بە دوا، پرۆگرامێکی چڕوپڕ و پێشــوەختی بۆ جینۆســایدکردنی کورد داناوە. ئەم جینایەتە مەزنە هەروا لە خۆڕا نەبوو بەڵکو سەرۆکی رژێم و دار و دەســتە زەبر بە دەســتە ئەساســییەکەی، هــزر و بیری شــۆڤێنیانەیان لێکردۆتــەوە و عەزیمەتیان لەســەر وەرگرتووە و لەسەری رشتبوون و پاشانیش بە داهــات و خێــر و بێری خــودی کــورد ئامادەکاریی کرد وکیمیایی و چەک و تفاق و تەقەمەنیی کوشــندە و دڕندە و کۆکوژ و قەدەغەی بە ملیارەها دۆلار وەدەســت خست و نیــاز و نیەتی گلاوی خۆی لە بەکارهێنانی ئەو چەکانە و سیاسەتی کورد قڕاندا هێنایە دی کە لە نموونەی چەند گــەورە کەتن و تاوانێــک زۆریان (جینۆســایدی کامڵ و تەواون) و بڕێکیشــیان (شروع)ن، وەک جینوسایدکردنی گوندەکانــی مەلەکان و گۆپتەپــە و چیمەن کە هەموویان وەبەر شــالاوی کیمیــاوی کەوتن، یا جینۆســایدکردنی تەواوی ئەو (ژمارەیــەی) بارزانییەکان کە گرتبوویانن یا زۆربەی هێرشەکانی ئەنفالەکان، بەلام مانەوەی دەرچوونی منداڵێکــی 12 ســالانە (تەیمور) لە نێو جینۆســایدکردنی حەشــاماتی هەزاران کەسەی هێرشــێکدا (شروع) ە و لە ویست و ئیرادەی رژێم بەدەر بووە، هەروەها بەکارهێنانی بۆمبی ناپاڵم و فســفۆری و تۆپــی ملم جۆراوجۆر کە لە

1974 دا لــە شــوێنەکانی قەڵادزە و زاخــۆ و چۆمان و گەلاڵــەدا قەســابخانەی ناوەتەوە و لە هەمــان وەختدا لە ئاکامی (نیشــانە نەپێکان) یا خۆشــاردنەوەی خەڵکەکە لە بــن تاویــرە بەرد و ئەشــکەوت و ژێر زەوی و شــوێنی قایمــدا وای کــردووە کــە زۆر کەس بەدەر لــە ئیرادەی رژێــم هەر بمێنن و تاوانەکە (شــروع) بێت، بەڵام ئەوەی ئاشــکرایە کە لەبەر خەتەرناکی و ئەنجامی مەترسیداری (شــروع لــە جینایــەت) دا و بۆ ئەوەیش هــەر تاوانێک لە سەرەتای دەستپێکردنیەوە سزا بدرێت و بەری لێبگیرێ و (ردع)یکیش بێت بۆ کەسانێکی کە بە تەمای ئەنجامدانی ئەو گەورە کەتنانەن، رێککەوتننامەی لە نێوبردنی جینۆســاید و ســزادان لەسەر ئەنجامدانی لە بەندی سێهەم (3/ ء) دا (تاوانــی کامڵ)ی بە جینوســاید ناوزەد کردووە و دەگەڵ (شروع) دا هاوتا و هاوشان و هاو سزای کردوون.

ئەمەش جێگای خۆیەتی و لێرەدا ســەرۆکی رژێم و دار و دەســتەکەی ئەنجامدانی هــەر تاوانێکیان لە بنەڕەتدا بە مەبەســتی جینۆســایدی تەواو بووە و ئەوەی لە قەتڵ و عام و ئەنفال و ژەهرباراندا دەرچوون (شروع) بووە و لە دەســەڵاتی ئەوان بالاتر بــووە. ئەو گوند و دێهاتانەی کە تا ســاڵی 1990 (کاتــی داگیرکردنی کوێت) مابوونەوە و وێران نەکرابوون هەروەها رانەگواستن و دەست لێنەدانی ئەو خەڵکانەی ناوی، (شروعە لە جینایەتی جینۆساید)دا[7].

پشـــكدارن یا كاركـــرده ئەســـڵییەكان لەبەئەنجامگەیاندنی تاوانی جینۆســـایددا، لە بەرایی ســـەرۆكی رژێم "ســـەدام حســـێن" ـە كە بەرپرسی یەكەم و بنەڕەتی جێبەجێكردنی سیاسەتی جینۆسایدە بەسەر كورددا و كاركردەی ئەسڵی و ئەساسییە لە كوشت و بڕ و قەتڵ و عام و لە سێدارەدان و شوێن بزركردن و وێرانكردن و راگواستن و ئەنفال و كیمیایی و .. هتد.

ئـــەو درندەیـــە كە لە هەیئەتی مرۆڤ دایە و بەرەســـمی پێنـــج پلـــە و پایەی بە خۆی بەخشـــیوە: (ســـەر كۆمار لە 1979، ســـەرۆكی مەجلیسی قیادەی ســـەورە لە 1979 ەوە، فەرماندەی گشتی هێزی چەكدار، سەرۆك وەزیران، ئەمینداری گشـــتی قیادەی قوتری حزبـی بەعس) لە ژێر پەردەی ئەو ســـیفەتە (قانوونی)یانەدا لە هەموو ئالێكەوە جینۆســـایدی ئەنجامداوە. بێجگە لە ئەو، كەسانی دیكەش لەگـــەڵ ئـــەودا وەك ئەنجامـــدەر و كاركردەی ئەســـڵی و بـــەو پێیەی كە لـــە مەركەزی بڕیـــارەوە نزیكبوون رۆڵی سەرەكییان لە تاوانی جینۆسایدكردندا هەبووە لە وانە:

(1) (عەلی حەسەن ئەلمەجید) ناسراو بە عەلی كیمیایی یا (عەلی ئەنفال): كە بەرەسمی سكرتێری مەجلیسی قیادەی سەورە و ئەندامی قیادەی قوتری حیزبی بەعس (1986) و وەزیـــری دیفـــاع (1990) و وەزیری حوكمی ناوخۆیی (1989) بـــووە، هەروەهـــا مودیری ئەمنی عـــام بووە لە

(1986-1988) دا و (ئاب و تشــرینی یەکەمی 1990دا) پارێــزگاری کوێت بــووە و لە 1987/3/29 دا بە ئەمینی مەکتەبــی تەنزیمی شــیمال دامــەزراوە و لــە دەرکردنی بڕیــار و جێبەجێکردنی تەواوی هێرشــەکانی ژەهرباران و ئەنفالەکاندا کارکردەی ئەسـڵی بووە، هەر بۆیەش ئەو ناوەی سەرەوەی لێنرا[8].

(2) بارزان ابراهیم الحسن التكريتي: سەرۆکی موخابەراتی گشتی (1979-1983) و لە ژێر پەردەی باڵیۆزی عێراق لــە بارەگای ئەورووپی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەرپرســی موخابەراتــی رژێــم بــووە لــە دەرەوەدا، و نوێنــەری حکوومەتــی عێراق بــووە لە لیژنەی مافی مرۆڤی ســەر بــە (UN) لە جنێــڤ (1989) و لە 1993وە، راوێژکاری ســەرۆک کۆمــارە بە پلەی وەزیر. ئەو کاتەی ســەرۆکی موخابــەرات بووە سەرپەرشــتی شــوێن بزرکردن و بە کۆمــەڵ کوشــتنی بارزانییەکانــی قوشــتەپەی کردووە و سەرپەرشــتی دامەزراندنی یەکەی بەرهەمهێنانی ژەهری کردووە لە کۆلیژی پزیشکی بە مەبەستی بەکار هێنانی لە کوشتنی نەیارەکاندا[9].

(3) طــه الجــزراوي: ئەندامــی هەردوو قیــادەی قوتری و قەومــی! حیزبی بەعســە، هەروەها ئەندامی مەجلیســی قیــادەی ســەورەیە و پێشــتر جێگری یەکەمی ســەرۆک وەزیــران و ئێســتا جێگری ســەرکۆمارە و قائیدی عامی

جەیشی شەعبیە کە سەر بە بەعسە، بەو سیفەتەی قائیدی عامە لە ئەنجامدانی هەموو تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی و جینۆساید دا، بەرپرسە کە (جەیشی شەعبی) لە کوردستان ئەنجامیداوە، بێجگە لەو کوشتارانەی بە نەخشەی خۆی و بە دەستی خۆی ئەنجامیداون.

(4) سعدون شـاکر محمود: رەئیسی هەیئەتی تەحقیقی بـووە لـە زیندانخانـەی (قصـر النهایة)ی بەدنـاو (دوای ئینقلابـی 1968) وئەندامی مەجلیسـی قیادەی سـەورە (1977 – 1990) و ئەمینی گشتی مەکتەبی میهەنی بەعس بـووە، و لـە 1973 و 1974 دا سـەرۆکی موخابـەرات بـووە و لـە 1979 تـا 1987 وەزیری ناوخـۆ بووە و یەکێکە لە نێزیکەکانی سـەدام، بەو سیفەتەی کە ئەندامی مەجلسی قیادەی سەورە بووە لە هەموو تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی و جینۆسـاید بەرپرسە کە رژێم ئەنجامیداون نەخاسمە ئەوانەی لە ئەنفالەکاندا ئەنجامدران[10].

(5) حسـین کامـل المجید: ئامۆزای سـەدام بوو، پلە و پایـەی گرنگی لـە لایەن سـەرۆکی رژێمـەوە پێدرابوو، لەوانە وەزیری بەرگری و سـەرۆکی دەسـتەی سنعەتی سـەربازی، داهێنەری شێواز و رێگاکانی جینۆسایدکردن بوو، هەر خۆیشی زۆری لێ پیادە کرد، بە دەستی خودی دیکتاتۆر بە سزای تاوانەکانی خۆی گەیشت.

(6) عودەی و قوسـەی: هەر دوو کورەکەی سەدام، بە

سەدان کەسییان بە دەستی خۆیان قەتل و عام کردووە و ئەوەی دووەمیان کە بەرپرسی جیهازی 'ئەمنی خاص'ە، فەرمانــی بە لــە ســێدارەدانکردنی بێ دادگایــی هەزاران دەرکردووە.

(7) ســەدام کامـل ئەلمەجیـد: لــە فەیلەقــی (ســارۆخ) دا بەرپــرس بــوو و لــە وەزارەتی ســنعەتی ســەربازی بەرپرســیاریەتی گەورەی هەبــووە، هەروەها لە جیهازی 'ئەمنــی خاص'دا. بە دەســتی دیکتاتۆر بە ســزای خۆی گەیشت.

(8) عیــزەت ئەلــدووری: جێگــری مەجلیســی قیــادەی ســەورەی رژێم، بەرپرسی لە سێدارەدانی بە کۆمەڵی بێ دادگایی بووە.

(9) محەمــەد حەمــزە ئەلزوبەیدی: بــۆ ماوەیەک کرایە ســەرۆک وەزیران، بەرپرسی لە ســێدارەدانی بە کۆمەڵ بووە لە ماوەی 1991 دا.

(10) ســبەعاوی ئیبراهیم: مودیری ئەمن و موخابەرات بووە، هەمدیس ســەدان کەســی بە دەستی خۆی قەتل و عام کردووە و، سەرپەرشتکاری بەشێکی لە سێدارەدانی بێ دادگایی بووە.

(11) فەریقی روکن ســابیر ئەلدووری: مودیری ئەمنی عام و مودیری پێشــووی هەواڵگری ســەربازی بووە لە هێرشــی کیمیایی هەڵەبجــە دا (ئاداری 1988) بەشــدار

بووە.
(12) فازل سلفیج محیمید ئەلعزاوی: ئەندامی مەجلیسی قیادەی سەورە و دیبلۆماسی و بالیۆز بووە و لە دوای (فازل بەراک) دا مودیری پێشووی ئەمنی عام بووە، سەرپەرشتی گرتن و ئەشکەنجەدانی ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتیانی کردووە لە گرتووخانەکانی موخابەراتدا.
(13) فەریقی (طیار) حمیدشعبان التکریتی: فەرماندەی پێشووی چەکی (فرۆکەوانی).
(14) لیوا روکن سولطان هاشم ئەحمەد: جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراقی و وەزیری بەرگری ئێستای عێراق.
(15) تاریق عەزیز: جێگری سەرۆک وەزیرانی ئێستا و وەزیری دەرەوەی پێشوو و بەرپرسێکی سەرەکییە لە (پاساودانی) تاوانەکانی رژێم و لە دەرکردنی زۆربەی بڕیارە نارەواکانی سەدام پشکداری سەرەکی بووە.
(16) سەعدون حمادی: سەرەک وەزیرانی پێشوو وەزیری دەرەوەی پێشوو و ئەندامی مەجلیسی قیادەی سەورە و قیادەی قوتری بەعس، لەو بڕیارانە پشکداریی کردووە کە بوونەتە هۆی لە سێدارەدانکردنی بێ دادگایی.
(17) محەمەد یونس ئەلئەحمەد: ئەندامی مەجلیسی قیادەی سەورە و ئەمینی نووسنگەی رێکخستنی

مەرکەزی، پشکداریکی سەرەکی بووە لە لە سێدارەدان و ئەشکەنجەداندا.

(18) فەریق تالع ئەلدووری: فەرماندەی فەیلەقی (پێنج) ی پێشوو، سەرپەرشتکاری قەسابخانەی بە کۆمەڵ بووە لە کوردستاندا لە کاتی شەڕی عێراق – ئێراندا.

ئەوە بێجگە لە "حسن علی العامری" ئەندامی مەجلیسی قیادەی سەورە و وەزیری بازرگانی پێشوو و عبدالله فاضل وەزیری ئەوقافی پێشوو، حاتم ئەلعزاوی، بەڕێوەبەری نووسینگەی سەدام و لەتیف نسەیف جاسم وەزیری کەلتووری! پێشوو و، سەباح میرزا، مورافیقی سەدام و، ماهیر عەبدولڕەشید، فەرماندەی فەیلەقی (1) ی پێشوو و، عەبدولڕەحمان ئەلدووری، مودیری ئەمنی عامی پێشوو و، عەبد حمود حەمید، سکرتێری تایبەتی سەدام بە پلەی وەزیر و مزهر موتنی ئەلعواد، ئەندامی مەجلیسی قیادەی سەورە و تەوای ئەندامانی تری مەجلیسی قیادەی سەورە و قیادەی قوتری و ...... هتد[11].

وەک روونمان کردەوە بەوەی کە (تیغ تیخەدان و ڕێ بۆ خۆشکردن) و (ڕێککەوتن) و (یارمەتیدان) بە پشکداری پاشکۆیی (المساهمة التبعیة) دەژمێررێن و سیفەتی ئیجرامیان لە پەیوەندییانەوەیە بە پشکداری و کارکردەیی ئەسڵییەوە، بەڵام لە بەرئەوەی بە گوێرەی روکنەکانی تاوانی جینۆسایدەوە رۆڵی بەرچاو و هەستپێکراو و

تەنانەت سەرەکیشـیان هەبووە و مەترسیدار بوون، بۆیە ڕێککەوتننامەی لە نێوبردنی تاوانی جینۆسـاید و سزادان لەسـەر ئەنجامدانی، لە بەندی 3/ ب، جـ ە دا دەقنووسی کـردوون و لـە ڕووی سـزا سـەپاندنەوە هەرسـێکیانی وەک یەک بەیەکسـانی مەحکووم کرد و حسێبی (تاوانی سـەربەخۆی) بۆ کردوون نەک بەسـتراوە بە پشـکداری ئەسـڵی، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە بەشـداربوون و دەور دیتنی تیغ تیخە و ڕێککەوتن بۆ نموونە، لە پشکدارییەکی ئەسـڵیدا ئەنجامی جینایەتـکاری (نەتیجـەی جورمی) بە دەستەوە بدا یان نەء، ئەوا بەپێی ڕێککەوتنی لە نێوبردنی جینۆسـاید بەهایەکـی نییـە و (وەک تاوانی سـەربەخۆ) سـایلی (جینۆساید)ی کامڵ و (شـروع) سزایان لەسەرە، ئەمەش دیارە لەبەر ڕۆڵی خەتەرناکی ئەم گەورە کەتنەیە بـۆ ئەوەیە کە لە هەر قۆناخێکدا بێت (بەر) لە ئەنجامدانی بگیرێت.

هەر لـەو ڕوانگەیەوە (بەندی 6/جـ) لە پێڕەوی دادگایی سـەربازی نێودەوڵەتیـش بـە ئاشـکرا مەحکوومـی ئەو شـێوە پشـکدارییە دەکات کە دەڵـێ (....ڕێنماییـکاران و ڕێکخەرانی نەخشـە یان پیلانگێڕان بۆ ئەنجامدانی یەکێک لەو گەورەکەتنانەی کە لە سـەرەوە هاتوون، بەشدارییان کـردووە لێیـان دەپرسـرێتەوە، لە هەموو ئـەو کارانەی لەلایـەن هەر کەسـێکەوە بـۆ جێبەجێکردنی نەخشـەکە

ئەنجامدراون).
دیــارە کە مەبەستیشــی لــە گەورەکەتنە ناوبــراوەکان هەموو ئەو کارانە بووە کە روکنی ماددی جینۆســایدیان پێکهێناوە[12].
نموونەی ئەمە (یۆلیۆس سترایشر) ی تاوانبار لە جەنگی جیهانــی دووەم کــە ناوی لە لیســتی ئەو (12) کەســەدا بوو بە لە ســێدارەدان ســزا درابــوون. وەک تاوانکارێک بــە ئەنجامــدەری تاوانی دژ بــە مرۆڤایەتی دانــرا لەبەر ئــەوە بوو کە تیغ تیخەی قەتڵ و عامکردنی یەهودیەکانی دەدا لــە رێگای چاپکراوێکی هەفتانــەوە کە (محرر) بووە تێیــدا[13]. بۆ روونکردنەوەی زیاتر وا لە (3) خاڵاندا زێتر دەیان ناسێنین:
(1) **تیغ تیخە دان و رێ بۆ خۆشکردن (التحريض)**: بریتییە لە (پاڵ پێوەنانی تاوانکار بۆ ئەنجامدانی تاوانێک بە کارتێکردن لەســەر ئیــرادەی و رێنماییکردنی بەو رووکارەی کە تیغ تیخەدەر گەرەکیەتی) لەوەشدا دەردەکەوێ کە ئەم هۆکارە سروشتێکی سایکۆلۆژی هەیە وەک کارتێکردن لە رێگای بەخشین و پاداشت و گەف و هەرەشە و چەواشەکردن و بەڵێنی شت پێدان[14]. ئەم شێوەیە پشکدارییە لێرەدا وەک (تاوانێکــی ســەربەخۆ و تایبەتی تەماشــا دەکرێ) ئەگەر جینۆسایدەکە ئەنجامبدرێت یان نەء .
دەتوانین سەرۆکی رژێم و داروودەستەکەی بە (تیغ تیخە

دەر) لە قەڵەمبدەین و دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانیشی بە (تیخ تیخە دراو)، ئەوەش چ لە کاتی خۆ ئامادە کردنیان دا بۆ جینۆساید یا ئاسانکردن یاخود لە کاتی تەواوکردن و بە ئەنجامگەیاندنی تاوانەکەدا دەبێت وەک ئەوەی کە دار و دەستەی رژێم لە سەرەتای تەرحیل و راگواستن و تێکدانی گوند و دێهاتەکاندا (لە دوای 1975) لە رێگای بەکارهێنانی دەسەڵاتی خۆیەوە بۆ جەیش، ماندانی ماددی و مانەوی ئەوسوپایەی دەدا بەوەی کە ئەنجامیدەدەن هەڵوێستێکی نەتەوەییە و داکۆکییە لە عارەبایەتی. هەروەها پاداشتکردنی توێژێکی بەرفراوانی رەفیق حزبیەکان لە نێو سوپادا و ئیغراکردنیان بۆ ئەوەی بتوانن بیروباوەڕی شۆڤێنیانەیان لەنێو مێشکدا بچێنن، ئەوە بوو لەژێر ئەو کاریگەرییانەدا بەر لە راگواستن وەک "ئاسانکارییەک" ئاو و کارەبا و خزمەتگوزاری شارەوانی و هۆبەکانی گواستنەوە و ئازووخەیان لێبڕین.

هەروەها ئەوانەی کە حوکمی لە سێدارەدانی تەنها و بەکۆمەڵیان جێبەجێ کردووە بە رێکوپێکی، پارە و پوول و پاداشت و سەرمووچەیان پێدراوە، بێجگە لەوە، هاندان و رێ خۆشکردن بۆ خەڵک و عەشایەرەکانی سەر بە رژێم لە عەرەبەکان بۆ ئەوەی (نەخشەسازی) وەربگرن لەسەر ئەوەی کە جێگای کوردە دەرکراوە راگواستراوەکان بگرنەوە و لە کوردستاندا پەرە بە سیاسەتی پیادەکردنی

جینۆســاید بدەن، دیارە کە ئەوەش لە ڕێگای بڕیارەکانی مەجلیسی قیادەی سەورە و شێوازی ترەوە بوون.

لە پاڵ ئەوانەیشــدا ڕژێــم تاوانی تیختیخەدانی لەســەر جینۆســایدکردنی کــورد بــە ئاشــکرایی ئەنجــام داوە، ئەویش لە ڕێگای دەزگا داپڵۆســێنەرەکانی وەک ســوپا و موخابەرات و ئەمن و ئیستخبارات و ئەندامانی بەعس، کە دیارە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی ڕژێم (ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان) لە پەروەردەکردن و ئامادەکردنی نەفسییانە و تیغ تیخەدانیاندا ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە.

(2) **ڕێککەوتــن**: ئەوەش بەمانای لێک بەســتنەوە و لێک گرێــدان و یەکگرتنــی دوو یا چەند ئیرادەیەکی هاوشــان و یەکســان دێت لەســەر ئەنجامدانی تاوانێــک. هەمدیس ڕێککەوتنیــش پەیوەســتە بــە لایەنــی نەفســییەوە، بەڵام هۆکاری دەربڕینیشــی هەیە چ بە قســە یان بە نووســین یــان تەنانەت بە ئاماژەیش[16] و هەمان ســیفەتی (تاوانی ســەربەخۆ)ی هەیــە، لێرەدا دەرکردنــی چەندین بڕیار لە لایەن ئەندامانی یەکسان و ڕێککەوتووی مەجلیسی قیادەی ســەورەوە چاکترین نموونەی ڕێککەوتنــی خیانەتکارییە و گرینگترینیــان ئیرادەی یەکگرتــووی ئەو ئەندامانە بوو کــە لە 1987/3/29 دا لە شــێوەی بڕیارێکی نوســراودا گوزارشــتیان لەو ئیرادەیەی خۆیان کــرد بە ئەنجامدانی جینۆسایدکردنی کورد لە شــێوەی کیمیاباران و هێرشی

ئەنفالـە بەدناوەکاندا، کـە وەک روونە تەنهـا دەرکردنی بڕیارەکـە تاوانێکی سـەربەخۆیە و بەجێبەجێکردن و بە تاوانی (رێککەوتن لەسـەر ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید) حسێبە.

(3) **یارمەتیـدان (ئالیـکاری)**: رەنگبێ بە بـێ یارمەتی و ئالیـکاری، تاوانکردن قورس و گران بێت، هەر بۆیەشـە رێککەوتننامەی لە نێوبردنی جینۆساید لە رووی سزادانەوە وەک تاوانێکی سەربەخۆی لە قەڵەمداوە. ئالیکاری بە مانای پێشکەشکردنی یارمەتی و هاریکاری ماددی و مەعنەوی (لـە هەر شـێوەیەکدا بێت) دێت، ئەوەیـش لە قۆناغەکانی ئامـادەکاری و ئاسـانکاری و تەواوکارییەکانی تاوانێکدا، واتە پێشکەشـکردنی هەموو ئەو ئامراز و ئیمکانیەتانەی کـە تاوانکار بـۆ ئەنجامـی تاوانەکەی ئامـادە دەکات، یا کارەکەی بۆ ئاسـان دەکا و کۆسـپی رێـگای لە بەردەم تاوانکاردا تەختدەکات یا تەنکیدەکات[17].

بەپێی ئەو ناساندنەی سەرەوە، هەموو ئەو دەوڵەتانەی کـە بە عیلـم و ئیـرادە و پێزانینـەوە چەکی کوشـندە و کۆکوژیان بە رژێم داوە، یا مەوادە خاوە پێکهێنەرەکانیان پێ فرۆشـتووە یا ئالیکارییان کردووە لە بەرهەمهێنان و دروستکردنی چەکی کوشندەدا، بەر ئەحکامی سزای ئەو تاوانە دەکەون. لەوەشـدا هەموو ئەو دەوڵەت و کۆمپانیا سـەربازی و بازرگانییانـەی ئەورووپـی و ئەمریکـی و

ئیدیکە بەشێکی بەرپرسیارێتی جینۆسایدکردنی کوردیان دەکەوێتە سەر، بەوەی کە ئەگەر ئالیکاری ئەوان نەبوایە، رژێم نەیدەتوانی وەک پێویست تاوانەکە ئەنجامبدات.

ئەوەتــا لــەو تەئکیدکردنەوەیەدا "ئۆبــان هیندریکس"ی پرۆفیسۆری تایبەتکار لە مەوادە ژەهراویەکان لە بەلجیکا بە زمانی خــۆی دانیپێدادەنێ کە: (ئەو مەوادانە لە کوێوە دێن؟ بەداخەوە زۆربەیان لە تەکنۆلۆژیای رۆژئاواوە دێن و لــە نێویاندا ژمارەیەکی زۆر لــە مەوادە کیمیاییەکان لە ولاتەکــەم بەلجیکاوە و لەمیان هــەردوو مینای "ئەنفیر و زیبروج" ـەوە ناردراونەتە دەرەوە و چاک دەزانین کە ئەو مەوادانە ئێستاکە لە عێراقدا کراون ... )[18].

هــەر لــەم بارەیــەوە رۆژنامــەی (تاگـس چایتونگ) ی ئەڵمانی کە لە بەرلین دەردەچێت، لە رۆژی 1989/1/26 ســەروتارێکی بڵاو کردۆتەوە تێیــدا ئاماژە بەوە دەکا کە کارگەی (عکاشات) لە گەورەترین کارگەکانی عێراقییە لە رووی بەرهەمهێنانی گازەکانی کیمیاییەوە و بۆ ئەو مەبەستە کارگــەی (Bechtel cosoup Incosposation)ی ئەمریکی لە گەورەترین بەشــداربووەکانی بەرهەمهێنانی ئەم گازەیە بۆ کارگەی (عکاشات)[19]. هەر وەک پەنجەنمایی ئــەوەش دەکات کە کارگەی ناوبراوی ئەمریکی تا ســاڵی 1982 لــە لایەن جۆرج شــولتزەوە بەڕێوەبــراوە، کە لە دواییــدا بوو بە وەزیــری دەرەوەی ئەمریکــی. هەروەها

سـۆڤێتییەكانی پێشـوویش درێغییـان لـە یارمەتیدانـی عێراق بە تایبەتی كارگەی (عكاشـات) دا نەكرد و بۆ ئەم مەبەستە (30) ئەندازیار و خەبیر و تەكنیكار لە عكاشاتدا بۆ بەرهەمهێنانی چەكی كیمیایی كاریان كردووە.

هەر هەمان سەروتاری رۆژنامەكە ئاماژە بە تێوەگلانی دەوڵەتانـی دیكـە دەكات وەك كارگـە و كۆمپانیاكانـی دەوڵەتانی (ئیتاڵی و بەلجیكی و سویسری و نەمساوی و فەرەنسایی و یۆگسلافیای پێشوو و بەرازیل و ئیسپانیا و هەردوو كۆریا) دەكات. هەروابێتەوە گۆڤاری (دیر شبیگل) ی ئەڵمانـی هەواڵێكـی لـە رۆژی 1989/1/31 دا بـڵاو كردۆتەوە و تێیدا ئاماژە بە تێوەگلانی كارگە ئەڵمانییەكان دەكا لـە بەرهەمهێنانـی چەكی كیمیایـی و بایۆلۆژیدا لە بەرژەوەندی عێـراق، وەك كارگەكانی (Sigmachime و plato Kuln) جگـە لـەوە هـاوكاری و یارمەتیدانـی (جاشـەكان) بۆ رژێم لـە: رێنماییكردن و ئاسـانكردن و زانیـاری دان و بە زەلیلی بوون بـە دەلیلی لەوێرانكردن و ئەنفالكردنـی دەیان و دەیان هەزار كەسـی مەدەنی كە وێ دەچێ سـەرانی رژێم نەشـیابن بە بێ ئالیكاری ئەو جاشـانە تاوانەكە ئەنجامبـدەن، چونكە جەیـش غەیرەز ئەوەی لە رووی جوگرافییەوە ناشـارەزا بووە و هێرشی ئـەوان لە سـەرەتا بواری بـۆ راكـردن و رزگاربوون و خۆشاردنەوەی خەڵكەكە دروستدەكرد و ئیستغلالكردنی

(بەرگی کورد) یش لە لایەن رژێم و جاشەکانەوە لە هێمن کردنــەوەی باری نەفســی خەڵکەکە کەم تــا زۆر رۆڵێکی بینی و بەو شێوەیە خەڵکەکەیان بە قسەی درۆ و دەلەسە هەڵخەڵەتاند و نەیانهێشت کەسێکی ئەوتۆی لێدەربچێت.

هەروەهــا هەموو ئەو داردەســتانە و ئەڵقە لە گوێیانەی رژێم لە حیزبی بەعسدا بە تاوانی (پارمەتیدان) تاوانبارن بەوەی لە کاتی ئەنجامدان و تەواوکردنی بەشێکی روکنی ماددی تاوانی جینۆسایددا، لە کیمیابارانی شێخ وەسانان لە 1987 دا بە سەدان بریندارى لێکەوتەوە، لە ژێر فشار و چاودێــری جەیــش و رەفیــق حزبییــەکان و (امتناع)ی دکتۆرەکان (تاوانی سلبی)، نەهێشترا لە خەستەخانەکاندا چارەســەر بکرێن و لە مەعەسکەری رەشکێن و هەولێردا زیندەبەچــاڵ کران[20]. لەبەر ئەوەی ئــەو کارانەی کە لە شێوەی پارمەتی و ئالیکاریدا ناوزەد کران رۆڵی سەرەکییان لە ئەنجامدان و راپەڕاندنی تاوانەکەدا هەبووە، بەرەنگێک کــە بە پێی ئەو ئالیکارییــە ئەنجامدانی تاوانەکە قورس و گران بووە، بۆیە لەو حاڵەتەدا ئەنجامدەر و تاوانکارەکانی بەکارکردەی ئەسلی لە قەڵەمدەدرێن[21].

## پەراوێزەکانی پاری سێیەم

(1) الدكتور علي حسين الخلف، الوسيط في شرح قانون العقوبات (النظرية العامة). چاپخانەی (الزهراء)، چاپی یەکەم، بەغدا 1968، ل 440.

(2)هەمان سەرچاوە، ل444.

(3)هەمان سەرچاوە، ل449 ل450.

(4)الدكتور عباس الحسني (القسم العام)، شرح قانون العقوبات العراقي الجديد، چاپخانەی (الازهر)،بەغدا 1969-1970،ل 145.

(5)دكتور علي حسين الخلف ؛ ل588، ل589.

(6)هەمان سەرچاوە، ل 639.

(7)بەڵگەیەکی زیندووی تری ئەوەی کەجینۆسایدی تەواو و (شروع) لەو گەورە جینایەتەدا، وەک یەک هاوشانن، و مەبەستی بنەڕەتی هەر جینۆسایدە، چونکە قسەیەکی نوێنەری دیکتاتۆر "عەلی حەسەن ئەلمجید"ە، کە لە 1988دا بۆ رەفیق حزبی و موستەشارەجاشەکانی کردووە و لەسەر کاسێت تۆمار کراوە و میللەت لە کاتی ڕزگارکردنی کەرکووک (1991/3/19) لە مۆڵگای ناوبراو دۆزیویانەتەوە. تێیدا سەرباری ئەوەی سووکایەتییەکی زۆر بە یاسای نێودەوڵەتی دەکا. دەڵێ بەس شەڕی عێراق – ئێران تەواو ببێت، ناهێڵم یەک کەس بمێنێ بەکوردی قسە بکات. هتد.

(8)(حقوق الانسان) جرائم ضد الانسانية، بەشی حەوتەم، ژمارە (42)، تشرینی دووەمی 1994، ل2.

(9)هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

(10)(حقوق الانسان)، مشروع اتهام صدام حسين واركان النظام العراقي، ژمارە 38، ئایاری 1994،ل7.

(11) بــۆ ئــەو ناوانە هەموو بگەڕێوە: حقوق الانســان، ژمارە 38، ئایــاری 1994، ل7. هەروەها ژمــارە 39، حوزەیرانی 1994 ل6و ل7 . هەروەها ژمارە 45 ئایاری 1995، ل2. بێجگە لەوانە بگەڕێوە لای میللەت کە باشترین سەرچاوەیە.

(12)د.عبدالوهاب حومد، الاجرام الدولي، ل306.

(13)بۆلیســتی ناوەکانی ئەم (12) کەســە و زانیاری دیکە بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ل 175و 216.

(14)د.علي حسين الخلف، ل670.

(15)بڕیاری س 83 کەلە 1982/1/10دا لە دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمەوە دەرچووە نموونەیەکی زەقی تیغ تیخەدانە، و ناوەڕۆکەکەی پاداشتی هەموو ئەو عەسکەریانە دەکا کە ئەو کەسە دەکوژن، هەوڵی ڕاکــردن دەدات ئەویــش بــە بەخشــینی (پێشــوەچونێکی زۆر باش/ قــدم ممتــاز) لەوەزیفەکەی و مۆڵەت پێدان بۆمــاوەی مانگێک لەگەڵ دیارییەکی گران بەها، بەو مەرجەی تەرمەکەی تەسلیم بکات. بڕوانە (حقوق الانسان) ژمارە(27)، حوزەیرانی 1993،ل 6.

(16)د.علي حسين الخلف، ل677.

(17)هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل683.

(18)ئۆبــن هیندریکــس، کارثة حلبجة، دراســات كردية، ژمارە (4) /1993/ ل96.

(19)بێجگــە لــە کارگەی (عکاشــات)، نــاوی زۆر کارگــەی تریش لەنێوەنــدی خەڵکــی کورددا بڵاوە، بــەوەی کە بەمــەواد و خیبرە و شــارەزایی ئیدارەی ئەمریکا و رووسیا و هەندێ دەوڵەتی ئەورووپی بەڕێــوە دەچــن؛ لەو کارگانــە: کارگەی ســامەڕا و کارگەی ناوچەی ســەلمان پاک و کارگەی بێجی و کارگە و تاقیگەی کیمیاوی مووسڵ و کارگەی نهێنی سەربازی (سەعد16)و......هتد.

(20)ئەندامێکی پێشــووی موخابەراتی عێراقی دەربارەی هێرشــی کیمیــاوی ناوچــەی بالیســان و شــێخ وەســانان (1987/4/16) لە

هەولێـر دەدوێ و دەڵێ: (خەڵکـە بریندارەکانیان بۆ نەخۆشـخانەی کۆمـاری بەسـەیارەی تایبەتیان هێنا کە ژمارەیـان لە (380) کەس پتـر بوو لە پیـر و ژن ومنداڵ، لە ژێر چاودێری پاسـەوانیدا مانەوە و ڕژێـم فەرمانـی دا کە چارەسـەر نەکرێن و هاتوچـۆ و پەیوەندی پێوەکردنیشـیان قەدەغەکرا و دوای ئەوەی ڕۆژێکیان هێشـتنەوە و لە شـەوی دووەمدا لە بینایەکی بچووکی شـاری هەولێردا زیندانیان کـردن و لەوێشـدا چەنـد ڕۆژێـک مانەوە و پاشـان بۆ شـوێنێکی نادیاریـان بـردن، بەڵام شـایەد هەیە کە لە نزیک سـجنەکەدا بووە، دەڵێ هەموویان زیندە بە چاڵ کراون. بڕوانە "حقوق الانسان" ژمارە 37، نیسان 1994، ل2.

(21)د. عەلی حسێن ئەلخلف؛ 689 و بەدواوە ...

## سزادانی رژێم و دادگاییکردنی.. چۆن؟!

ڕێککەوتننامەی لەنێوبردنی جینۆساید و ڕەشەکوژی کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی یاسای نێودەڵەتی، و عێراق لە 1958/3/3 دا بڕوایی پێداوە، پڕ بەهاترین مەسەلەکە (دیاریکردنی دادگا و سزا) ی تاوانکاران بە ڕوون و ئاشکرایی پەنجەی بۆ ڕانەکێشاوە[1] و زۆربەی بەندەکانی 5،4،3 تەنها باسی سزادان دەکەن بەڵام چۆن و چ سزایەک؟ ..

ئەوە نەبێت کە لە بەندی (1)یدا جینۆساید بە (جینایەت) ناوزەد دەکا و دیارە کە سزای جینایەتیش لە نێوان لە سێدارەدان و بەندکردنی تا هەتا و وەختی دایە. لە ڕووی دادگایی کردنیشەوە بە پێی بەندی (6) کەسانی گومانبار

بە جینۆسـاید یـا هەر کارێکی لەوانەی لـە بەندی (3) دا ناوبراون، رەوانەی دادگای پسپۆڕی ئەو دەوڵەتە دەکرێن کـە تاوانەکە لە سـەر خاکەکەیـدا کراوە یا لـە بەرامبەر (دادگایەکی سزایی نێودەوڵەتی) دا بەو مەرجەی کە لایەنە رێککەوتووەکان دان بە پسپۆڕایەتییەکەی دابنێن. لەوەتەی ئەم رێککەوتننامەیە کاری پێکراوە (1951) یا هەر لە دوای شەڕی دووەهەمەوە هەتا نووکە، ئەم دادگایە دانەمەزراوە و بوونی نییە و لە هەمان وەختدا بە دەیان و سەدان تاوانی جینۆسـاید و دژ بـە مرۆڤایەتـی کـراون و لەبەر دیاری نەکردنی سـزا و نەبوونی دادگایەکی سزایی نێودەوڵەتی تاوانکاران، هەمیشـە بۆی دەرچوون[2]. راستتر وابوو لە نەبوونی دادگادا، سزادانی تاوانکارەکانی جینۆساید بەپێی مەبدەئی ئیختساسی خرکر و گشتی (الاختصاص الشامل) بوایە، بەو مانایەی تاوانەکە وا بژمێردرێ کە هەڕەشە لە ئاشـتی و ئاسایش و ئیستقراری گەلان دەکا و ئاورووو و سووکایەتییە بۆ کەرامەتی مرۆڤایەتی و لە حاڵێکدا ئەگەر تاوانکاران لە شـوێنی ئەنجامدانی جینۆسـایدەکە توانیان دەربـاس ببـن و رابکەن، لە هـەر دەوڵـەت و ئێقلیمێکی دونیادا دەسـگیر کـران، هەر لەوێ بدرێنە دادگا و سـزا بدرێـن. بەو پێیـەش ئەرکی گرتنیان دەکەوێتە ئەسـتۆی کۆمەڵگـەی نێودەوڵەتی کە دەزگایەکی پۆلیسـی جیهانی (ئەنترپـۆل) ی بۆ ئەم مەبەسـتە تەرخان کـردووە[3]. لە

دەورەی پەنجــا و نۆیەمینــی کۆمەڵەی گشــتیدا (1995)
هەر لەو مانا و مەفهوومەدا دەوڵەتان لەســەر ئەوە کۆک
بــوون کــە تاوانکارانــی نموونەی کەتنەکانی شــەڕ و دژ
بــە مرۆڤایەتی و جینۆســاید و شــوێن بزرکردن بۆ هەر
دەوڵەتێک رایان کردبێ لە کاتی دۆزینەوەیاندا لە داداگای
ئــەو دەوڵەتەدا دادگایی بکرێن یا تەسـلیم بە وڵاتێکی تر
بکرێــن بۆ دادگایی کردنیان وەلێ ئایا ئەمە تا چ رادەیەک
لە سەر زەمینەی واقیعدا جێ بەجێ دەبێت ؟!.
لێرەشدا کە باسی دادگایەکی سزایی نێودەوڵەتی دەکەین
مانای ئەوە نییە دەوڵەتان واز لە ئەرکی خۆیان بهێنن و بە
تەمای ئەو دادگایە لێی پاڵ بکەون، بەڵکو دەبێ دەسەڵاتی
دادوەریــی ناوەخــۆی دەوڵەتــان دوا هــەوڵ و هیممەت
بکەن بۆ تەســلیمکردنی تاوانکاران بــە داد و عەدالەت لە
ناوخــۆدا چونکە ئەگەر هیــچ رێگایەک لە بــەردەم دادگا
نیشتمانییەکاندا نەما ئینجا دادگای نێودەوڵەتی دەستبەکار
دەبێــت[4]. بــە هەرحــاڵ لــە 1993/3/22 دا ئەنجومەنی
ئاسایشــی نێودەوڵەتی بڕیــاری ژمارە (808) ی دەرکرد
کە تایبەت بوو بە دامەزراندنی دادگایەکی نێودەوڵەتی بۆ
دادوەریی کردنی تاوانکارانی شەڕ لە دەوڵەتی یۆگسلافیای
پێشوودا، دامەزراندن و دەستبەکار بوونی ئەم دادگایە کە
بەپێــی رێککەوتنی دایتۆن خەریکە دێتە بەرهەم و واز پێ
لە دەســەڵات هێنانی رادۆڤان کارادڤیچ و ئەوانی تر، هەر

پەیوەست بەو مەسەلەیە بوو کە وەک تاوانکارێکی شەڕ ناسێنران؛ دامەزراندنی ئەم دادگایە هەنگاوێکی کاریگەر بوو، چونکە لە دوای شەڕی دووهەمەوە یەکەم جارە کارێکی لەو بابەتە دەکرێت، جگە لەوەی دامەزراندنی دادگا ئاگادارکردنەوە و وەهەڕەش خۆ هێنانەوەیەکیشە بۆ تاوانکارانی تر و (ردع) ێکیشە بۆ ئەوانەی بیر لە سەرپێچیکردن لە یاسای نێودەوڵەتی و پێشێلکردنی رێکەوتننامەی لەنێوبردنی جینۆساید دەکەنەوە، هەر وەک یەک لە ئەندامە هەمیشەییەکانی ئەنجومەنی ئاسایش لە کۆبوونەوەیەکیاندا تا نیشانی ئەو حەقیقەتانەی کرد بوو[5].

بەلام لەگەڵ ئەوانەیشدا، ئەم دادگایە کاتییە و هەمیشەیی نییە، بەڵکو تایبەتە بەو ماوەیەی کە تاوانکارانی (سربی) تێدا دادگایی دەکرێن، هەروەها گشتی و جیهانییش نییە، بەڵکو هەر دادگایی کردنی (سربەکان) دەگرێتەوە و ناوەڕۆکی دادگایی کردنەکە تەنها بۆ (تاوانەکانی شەڕ)ەو تاوانەکانی دژ بە ئاشتی و دژ بە مرۆڤایەتی ناگرێتەوە. تاوانکارەکانی شەڕ لە جەنگی گێتی دووهەمدا، دادگایی نۆرمبێرگ و تۆکیۆ و ئیدیکەیان بۆ دامەزرا و بە سزای خۆیان گەیشتن، تاوانکارەکانی (سربی)یش رەنگبێ تۆڵەی هەموو بۆسنییەکانیان لێبیێتەوە و هیوای بەهێز هەیە بۆ دادگایی کردنیان، بەلام دڕندانەترین رژێم کە

رژێمی ســەدام حسێن و دارو دەستەکەیەتی بە ئەنقەست لەبیـر کـراوە لە کاتێکدا هەموو ســەرچاوەکانی یاســای نێودەوڵەتی (بە تایبەتی پەیماننامە و جاڕنامە و رێککەوتن و پرۆتۆکۆڵـەکان) ی ژێـر پـێ خسـتووە کـە قەدەغەی تاوانەکانــی شــەڕ و دژ بە ئاشـتی و دژ بــە مرۆڤایەتی، نەخاســمە (جینۆساید) دەکەن. بۆیە سایلی بڕیاری 808، دەرکردنی بڕیارێکی تر لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ دادگایی کردنی بە پەلەی رژێم و دار و دەستەکەی کارێکی پێویســتە بە تایبەتیش کە هەر ئــەم ئەنجوومەنە بڕیاری ژمارە "688" ی دەرکردووە کە هەر بەپێی ئەو بڕیارەش لێژنەی مافی مرۆڤی ســەر بە (UN) مســتەر (ماکس ڤان دیرشتوئیل) یان وەک بڕیاردەرێکی تایبەت بە لێکۆڵینەوە لە بارەکانی مافی مرۆڤ لە عێراقدا لە 1992 تەرخانکرد و ئەو بەڕێزە تا ئێستا کاری زۆری ئەنجامداوە.

ئەگــەر ئــەوەش نەبێـت دەرکردنــی بڕیارێکــی تــر بە دامەزراندنــی دادگایەکی ســزایی نێودەوڵەتــی یا دادگای نێودەوڵەتــی بۆ مافی مرۆڤ، لە پێویســت پێویســتی ترە و چەنــدی دوا بکەوێـت واتای خوێن رشـتن و ئێبادەی زیاتــر و چاکتر دەرباز بوونــی تاوانباران دەگەیەنێ. ئەو دادگایەی کە دادەمەزرێت وا پێویستدەکات کە هەمیشەیی و بەردەوام و بۆ گشـت و سەرتاســەری دنیا بگرێتەوە، واتــە (دادگایەکی ســزایی نێودەوڵەتی هەمیشــەیی) بێت

و یەکـەم کاری دادگایـی کردنی سـەرۆکی رژێم و دارو دەستەکەی و هەموو ئەوانەی کە پەیوەنددارن بەو تاوانەی کە کردوویانە، ببێت. دەوڵەتە زلهێز و زەبر بەدەستەکانی دنیـا، رەنگبێ لە دامەزراندنی ئەو دادگایەدا جیددی نەبن، ئەگەرنـا لە مێژە پێڕەوی بنەڕەتی ئـەم دادگایە لە لایەن لێژنەی یاسـای نێودەوڵەتییەوە دانراوە و دارێژراوەتەوە و پـڕۆژەی کۆتایی لـە 1994ـەوە بۆ کۆمەڵەی گشـتی نەتـەوە یەکگرتـووەکان بـەرز کراوەتـەوە. بـۆ ئەوەی دادگای چاوەڕوانکراو دادوەرانە و کاریگەرانە دەستەڵاتی فیعلی و راسـتەقانی خۆی بەکاربهێنێ و سـەربەخۆ بێت لە بڕیارەکانیدا، رێکخراوی لێبوردنی گشـتی (ئەمنسـتی ئەنتەرناشـنال) وەک زامنکردنێـک چەند راسـپاردەیەکی دەرکـردووە کەوا چاکە دادگای چاوەڕوانکراو رەچاویان بـکات، لەوانە بۆ نموونە: پێویسـتی ئـەوە دەکات کە ئەم دادگایـە لـە خـۆڕا و بـێ ئەوەی هیـچ دەوڵەتێـک مافی هەڵبژاردنی ئەو کێشـە یـا گرفتە یـان تاوانەیان هەبێت، کـە دادگا تەماشـای دەکات، خـۆی هەموویـان تەماشـا بـکات، هەروەها داواکاری گشـتی لە دادگا بە پێشـنیارو موبادەرەی خۆی و لە لایەن خۆیەوە دەسەڵاتی لێتۆژینەوە لە تاوانەکانی هەبێت و پێشکێشی دادگایان بکات، یا خود پێویسـتیی زامنکردنی هەمـوو گەرەنتییەک بکا لە پێناوی دادگایی کردنێکی عادیلانە لە هەموو قۆناخەکانیدا ... هتد[6].

لــە دوای گرتن و داگیرکردنی کویــت (1990/8/2) و لە پاش راپەڕین و کۆچڕەوی چەند ملیۆنی کورد لە (نیسانی 1991)دا، مارگرێت تاتشــەر لەوەختــی حوکمڕانییەکەیدا هەروەهــا جۆن میجەری ســەرۆک وەزیرانی بەریتانیا و دۆگلاس هێــردی وەزیــری دەرەوەی ئــەو ولاتە و لورد شوکروســی داواکاری گشــتی بەریتانیا لە دادگاییەکانی نۆرمبێرگ و وەزیرانی دەرەوەی ئەورووپا لە لوکسمبۆرگ داوایان کرد کە سەدام و دار و دەستەکەی بدرێنە دادگا[7].
تەنانەت هانز گینشــەری وەزیری پێشــووی ئەڵمانی زۆر کاریگەرانەتر فایلی تاوانەکانی رژێمی بەغدای هەڵدایەوە و لە ڕووی راگەیاندنەوە ورووژاندی، کەچی لەسەر داوای دەســەڵاتدارانی ئەمریکا لە ژێر پەردە و بیانووی ئەوەی کە ئەمریکا پێی خۆشــە گەلی عێراقی خۆی سەرۆکەکەی دەسگیربکات !! فایلەکە داخرایەوە[8].
ڕەنگبێ ورووژاندنی دادگایی کردنی (ســەدام حســێن) یــش لــەلای زۆربــە، لەبەرداگیرکردنــی کویــت و لێدانی دەســەڵاتی ئابوورییان بووبێت نەک (جینۆساید و قەتڵ و عامکردنــی کورد) بەڵگەش بۆ ئەوە لە کاتی کۆچڕەوە بێ چارەنووســەکەی 1991، کاتێک کە ســەرۆکی پێشووی ئەمریکا لە شــوێنی خەڵــوەت و حەوانەوەیدا لێی ئاگادار کرایــەوە فەرمووی! ئەوە کێشــەیەکی ناوخــۆی عێراقە، بەو مانایە کە ئەمریکا مافی دەســتتێوەردانی نییە !. ئەوە

لــه کاتێکدا ســوپای (هاوپەیمانان) لە نێــو قووڵایی خاکی عێراقــدا بــوون و لەوەختێکدا کە لــەو حاڵەتانەدا ماف و مەبدەئی دەستێوەردانی ئینسانی لە گۆڕێیە.

بەهــەر حاڵ ئەگەر پاڵپشــتی و هەڤســۆزیی شــەقام و رای گشــتی دنیا، بە تایبەتی شەقامی دەوڵەتانی ئەورووپا نەبوایە، رشت بوونیان لەسەر پارمەتیدانمان نەبوایە، ئەوا کارەساتی گەورەتر و ترسناکتر رووی دەدا. ' بەراوردێکی رێژەیی' لە نێوان ئەو بەڵگەنامانەی کە لەسەر تاوانەکانی رژێــم بە تایبەتی (جینۆســاید) دا لەبەر دەســتدان لەگەڵ بەڵگەنامە و ئامادەکارییەکانی تاوانکارانی شەڕی دووەم لە دادگای نۆرمبێرگدا دەری دەخا کە بەڵگەنامەکانی ئەوەی یەکەم ئەگەر زێدەتر و بەهێز تر نەبن، ئەوا هیچیان کەمتر نییە. هەر بــۆ نموونە دادگای نۆرمبێرگ کە (11 مانگ و 20 رۆژی خایاند) لە 1945/11/20 تا 1946/7/1 گوێی لە 96 شــایەد راگرت و فەرمانی بــە خوێندنەوەی 143 شایەدیی نوسراو دا و لێژنەیەکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخــی ئەو رێکخراوانەی کە بــە جینایەتکار تاوانبار ببــوون، دەستنیشــانکراو و ئــەم لێژنەیە گوێــی لە 101 شــایەد راگرت و لە 1809 (تصریحات) ی نووســراوی کۆڵییــەوە و چەندیــن تۆن بەڵگەنامە، رێکخــران و پۆلێن کران و دوای وەرگێرانیان لێتوژینەوەیان لەسەر کرا[9].

دادگاییەکە لە (400) دانیشتن – جلسە – دا ئەنجامدرا

و لاپەڕەکانی لێتۆژینەوەی زیاتر لە 15 هەزار لاپەڕە بووە و ئەوانــەی کە حوکمدران 22 زەعیمی نازی بوون. بەڵام بەڵگەنامەکانی تاوانبارکردنی ســەدام و دار و دەستەکەی : لە هەموویان گرینگتر ئەو بڕیارانەیە کە هێزی یاساییان هەیە و لە مەجلیســی قیادەی ســەورەوە دەرچوون و لە (الوقائــع العراقية) بڵاوکراونەتــەوە، هەروەها دەیان تۆنە دۆکیۆمێنتــی جۆراوجــۆر کە خۆیان لــە ملیۆنەها لاپەڕە دەدەن و لە ماوەی 1991 لە دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی رژێـم لــە کوردســتان گیــراون و پارێــزراون، جگــە لە شــوێنەواری خاپوورکــراوی 4000 گونــد و ژمــارەی ئــۆردوگا زیندانییــە زۆرەملێــکان و زیندانخانــەکان و ئەنفالکردنــی 182 هــەزار کــەس کە نــاوی نزیکەی 17 هەزاریــان لــە لای مســتەر دێر شــتوئیل پارێــزراوە، و شــوێن بزرکردنی زیاتر لە 8 هەزار بارزانی و بە کۆمەڵ کوشــتنیان لە ژێر ئازار و ئەشــکەنجەدان و راگواســتن و شــوێنە ونکــردن و زیندانیکردن و لە ســێدارەدانکردن و دەرپەڕاندنــی زیاتر لە (200) هــەزار کوردی فەیلی و کیمیایی و لە ســێدارەدانکردنی راستەوخۆی بێ دادگایی دەیــان هەزار بێ گوناە کە دیارە ئەم رووداوانە بە بەڵگە و ژمــارەوە لــە لای بەڕێز دێرشــتوئیل و رێکخراوەکانی وەک میدڵ ئیست و ئەمنستی ئەنتەر ناشنال و رێکخراوی عەرەبــی و عێراقی مافەکانی مــرۆڤ، دوای لێکۆڵینەوە و

بەدواداچوون و ساغکردنەوەیان لە لایان پارێزراون و خودی دێرشتوئیل و ئەم رێکخراوانە دەتوانن بۆ ئەم مەبەستە بە کاریان بهێنن .. هەروەها (گۆڕە بە کۆمەڵەکان) کە سەرتاسەری کوردستانی گرتۆتەوە، بەڵگەیەکی تری جینۆسایدکردنی کوردە، جگە لەو کەسانەی کە لە هێرشە کیمیاییەکاندا، ئەگەر بە نیوەچڵی و بریندارییش بێت رزگاریان بووە، دەتوانرێت وەک گەواهی و شایەدی دان بە کاربهێنرێن، هەروەها ئەو فیلمە ڤیدیۆیی و دەنگییانەی کە لە دامودەزگا ئەمنییەکان گیراون، ئەوانیش سوودی زۆریان لێدەبینرێ بە تایبەتی قسەکانی عەلي حەسەن ئەلمەجید کە ریکۆرد و تۆمار کراوە و بە ئاشکرایی باسی جینۆسایدی ناوی 'کورد' یش دەکات ... هتد. بەوەش کە هەر بۆ نموونە ئاماژەیان بۆ کرا، دانیشتنەکانی دادگایی کردنی سەدام و ئەرکانی رژێم زۆر زیاتر دەبێ لەوەی نۆرمبێرگ و هەر ئەندامێکی گەلی کورد کە وەبەر هێرشی ئیبادە و (سیاسەتی تواندنەوە) ی بەعس کەوتبێ دەشێ بکرێن بە شاهێد.

ئەوانەش بە هەزاران و سەدان هەزاران نەخاسمە ئازار و ئەشکەنجە دراون و کیمیایی لێدراو و راگوێزراو و دەرکراوەکان .. هتد. بە هەر جۆر دوای دانانی پێڕەوی دادگای سزا نێودەوڵەتی و دەرکردنی بڕیاری 808 سەبارەت بە دادگایی کردن و سزادانی سربەکان،

هیـوا زۆره که دادگایی سـزایی نێودەوڵەتی هەمیشـەیی بـە گورجـی بێتە مەیدان و چالاکانە کار بکات، لەوەشـدا فەرومفایێکی زۆر لەو تاوان و گەورە کەتنانەی سەرۆکی رژێـم و داروده‌سـته‌که‌ی ده‌بینی لـه هێنانه‌کایه‌ی چه‌ند مه‌بده‌ئێکی نوێ له یاسـای نێوده‌وڵه‌تیـدا، چونکه ئه‌وه‌ی رژێم ئه‌نجامیدا، داهێنان و نوێکاری له تاوانی هه‌مه‌چه‌شن و جینۆسـایددا تێدا بوو، هــه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ش ئه‌م دادگایه جیاوازی ده‌بێت له گه‌ڵ دادگای نۆرمبێرگدا.

## جینۆساید و بنەمای تەسلیم کردنەوەی تاوانباران

*** ئایا ئەنجامدەرانی جینۆساید و بە کۆمەڵکوژی، تاوانکاری سیاسی، یان جینائین؟**

مەبدەئی تەسلیمکردنەوەی تاوانکاران رووکارێکی ئالیکاری نێودەوڵەتییە لە بواری نەهێشتن و بنبڕکردنی تاوان و گەورەکەتندا و بریتییە لە داوای دەوڵەتێک بۆ دەوڵەتێکی تر بە تەسلیم کردنەوەی تاوانبارێک بۆ دادگایی کردنی یان جێبەجێکردنی حوکمێکی دادوەری بەو حیسابەی کە تاوانی لەسەر خاکەکەیدا کردووە[10]. بنەڕەتی ئەو مەبدەئەش لەوەدا هاتەکایەوە، وەختێک کە تاوانکاران لەدەوڵەتێکدا کەتنەکەیان دەکرد و بەر لە گرتن و دەسگیرکردنیان یا دوای دادگایی کردن و پێش جێبەجێکردنی حوکم بۆ ئیقلیمی وڵاتێکی تر کە تاوانە

ئەنجامدراوەکان لە یاساکانیدا سزایان لەسەر نییە، رایان دەکـرد، لەبـەر ئەوەیش کە دەسـەڵاتی دەوڵـەت هەر لە چوارچێوەی سنووری دانپێدانراوی خۆی دایە، تاوانباران لە دەست سزا رزگارییان دەبوو و بۆی دەردەچوون[11]، بەڵام دیارە ئەم حاڵەتە هەموو چەشنە تاوانێک ناگرێتەوە و هەمـوو جۆرە کەسێکیشـی ناچێتە ژێر لەوانە : ئەوەی تاوانـی سیاسـی کـردووە، دەوڵەتان چ لە دەسـتوور و یاسا ناوەخۆکانیان یا پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان لەسەر دەقنووسکردنی بنەمای (تەسـلیم نەکردنەوەی تاوانکارە سیاسییەکان) کۆکبوون و ئەحکامی تایبەتییان بۆ دانا کە لە تاوانی ئاسایی جیای بکاتەوە. بە گوێرەی جینۆسایدەوە، رێککەوتننامەی نەهێشتنی جینۆساید و سزادان لەسەری بـەدەر لەوەی کە تەبیعەتی جینۆسـایدەکە سیاسـی بێت یـان نەء، بە تاوانێکی ئاسـایی لە قەڵەمـداوە، ئەوەش بۆ ئەوەی تاوانکارە راکردوو و هەڵاتووەکان بە بڕوبیانووی (تاوانی سیاسی) لە تەسلیمکردنەوە و دادگایی و سزادان رزگاریـان نەبێت، ئەوەش بەنـدی (7) لە رێککەوتننامەی ناوبـراو بە رەهایی روونـی کردۆتەوە و تێـدا دەوڵەتە بەشـداربووەکان (لەوانە عێـراق) بە بەڵێندانیـان، زامنی رەزامەندبوونی خۆیان لەسەر تەسلیمکردنەوە داوە.

لە حالەتێکیشدا ئەگەر تاوانکارێک لە ئیقلیمی دەوڵەتێکی تر شـێوە جینۆسایدێکی ئەنجامدا و پاشان پەنای بردەوە

بەر دەوڵەتەکەی خۆی و خۆی لە سزا رزگار بکات، لەسەر ئەوە لە ئەسـڵ و بنەڕەتـدا هیچ دەوڵەتێـک هاووڵاتیانی خـۆی بەپێی مەبدەئی (تەسـلیم نەکردنـەوەی هاووڵاتی) تەسـلیم بە دەوڵەتێکی تر ناکات، چونکە ترسی ناڕەوایی دادگای بیانی لێدەکرێت و جگە لەوەش هاووڵاتی هەیبەت و کەرامەتـی دەوڵەتە، بەڵام هەندێک دەوڵەت لە روانگەی رێزنان لـە مافي مرۆڤ و هەمەجیەتی جینۆسـایددا ئەم ڕچەیان شکاندووە، لەوانە بەریتانیا و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا[12]. هەروەها کۆماری ئیتالیا لە دەستووری 1967 یدا زۆر راشـکاوانە دەڵێ: مەبدەئی تەسلیم نەکردنەوەی هاووڵاتیـان، ئەو هاووڵاتییە ئیتالیانە ناگرێتەوە کە تاوانی جینۆسـایدیان ئەنجامداوە[13]. دەسـتووری ئیتالی چاکی کردووە و لەسـەر ئەوە لەسـەر هەمـوو دەوڵەتانی دنیا پێویسـتە کە بە گوێرەی تاوانکارانی جینۆسـایدەوە چاو لـە ئیتالیا بکـەن و واز لە مەبدەئی تەسـلیم نەکردنەوەی هاووڵاتیـان بهێنن، چونکە ئەم تاوانە ژێر پێ خسـتنێکی گـەورەی کەرامەتـی مرۆڤایەتییە لە هەموو شـوێنێکدا و ئەو دەوڵەتەی تاوانبارێک لە ژێر باڵی خۆیدا حەشار دەدا و بواری دادگایێکی راسـت و رەوای نادات (با هاووڵاتی خۆیشـی بێت) ئەوا سـووکایەتی بە بـوون و کەرامەتی مرۆڤایەتـی دەکات و لەو حاڵەدا جێـگای خۆیەتی ئیلزام بکرێ بە تەسلیمکردن.

لێرەدا هەموو ئەو دەوڵەت و ئیقلیمانەی کە سەدام حسێن تاوانی جینۆسایدو ئەوانی تری دەرهەق کردوون یا لێی زەرەرمەند بوون، مافی خۆیانە هەچ کاتێک بۆ دادگایی و سزادان داوای تەسلیمکردنی سەدام حسێن و دارو دەستەکەی بکەن، ئەوەش بەپێی مەبدەئی "جیهانێتی لێ تایبەت بوون" (عالمیة الاختصاص)[14]. بەندی سێیەم لە "رێککەوتننامەی بە سەرنەچوونی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی 1968/11/26" زامنی پەیمان و بەڵێنی دەوڵەتە لایەنی بەشدار بوو لەو رێککەوتننامەیەدا دەکا کە لەسەر ئاستی ناوخۆدا هەموو هەوڵێکی یاسایی و غەیرە یاسایی بدەن بۆ ئەوەی بتوانرێ بە پێی یاسای نێودەوڵەتی ئەو کەسانەی کە لە بەندی دووەمی ئەم رێککەوتننامەیەدا ئاماژەیان بۆ کراوە تەسلیمبکرێن.. بەندی دووەمی ئەم رێککەوتننامەیەش پەنجەنمای ئەو کەسانەی کردووە کە پێویستە تەسلیم بکرێنەوە:

(1) نوێنەرانی حوکمڕانیی دەوڵەت و ئەو تاقە کەسانەی کە وەک کارکردەی ئەسڵی یان بەشداربوو، پشکدارییان لە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی (جینۆساید و هیتردا کردووە)[15].

(2) تیخ تیخەدەر و رێ بۆ خۆشکارانی راستەوخۆ!

(3) پیلانگێڕان بۆ ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید و ئیدیکە.

(4) ئەو نوێنەرانەی دەسەلاتی دەوڵەت، کە لە ئەنجامدانی جینۆسایددا خۆیان گێل کردووە و شلیان کردووە.
هەروەها "بنەماکانی ئالیکاری و هەرەوەزی نێودەوڵەتی لە تاقیبکردن و گرتن و تەسلیمکردنەوە و سزادانی کەسانی تاوانبار بە ئەنجامدانی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتـی" کە بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشـتی(UN ژمارە 3074) (د- 28) لە 3ی کانونی یەکەمی 1973 دا دەرچووە؛ لە بنەمای (5) دا دەڵێ: ئەو کەسانەی کە بەڵگەیان لە دژدا هەیە بەوەی تاوانەکانی جەنگ یا تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتییان ئەنجامداوە دەدرێنە دادگا و سـزا دەدرێن، ئەگـەر بە تاوانبـار دەرچوون، ئەمــەش وەک بنەمایەکی گشـتی لەو دەوڵەتانەی کە ئەم تاوانانەیان لێ ئەنجامداوە و لەم بارەیەوە دەوڵەتان لە هەرچییەکی کە پەیوەندی بە "تەسـلیم کردنەوەی " ئەو کەسانەوە هەبێت هەرەوەزیی یەکتر دەکەن، لێرەدا وەک بەرپرسـیاریەتییەکی ئەخلاقی و یاسـایی و ئینسـانی لەسـەر هەموودەوڵەتان پێویستە هــەرەوەزی یەکتر بکەن لە پێناو سـەلماندنی تاوانباریی سەدام و دارو دەسـتەکەی لە ڕێگای بەڵگەنامەکانەوە، و پاشـان داوا و هەوڵی تەسـلیمکردنی بە دادگا و سزادانی بە تایبەتی لایەن و دەوڵەتە زەرەرمەندەکان.

## جینۆساید کۆنیش بێت، بەسەر ناچێت

سەرەتا، بە سەرچوون (التقادم) بەو واتایە دێت کە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دیاریکراو بەسەر ئەنجامدانی تاوانێک، بێ ئەوەی داوای سزایی لەسەر (تەحریک) کرابێت، ئەوا داواکار و دادگا بە هیچ شێوەیەک مافی لێپرسینەوەی نامێنێ و تاوانەکە بە هۆی بەسەرچوونی ئەو ماوەیەی کە یاسا دیاریکردووە و بە هۆی بێدەنگ بوونی داواکار بەسەر دەچێت، هەروا پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی دیاریکراو بەسەر جێبەجێ نەکردنی سزایەکدا لە مێژووی دەرچوونی حوکمەوە سزایەکە لەسەر تاوانبار لادەچێ و دەکەوێت.

بەو پێودانگە ئەگەر بەسەرچوون (التقادم) بۆ تاوانی

ئاسـایی تـا راددەیـەک لۆژیکـی و لەبـار بێت ئـەوا بۆ ترسـناکترین تاوانــی دژ بە مرۆڤایەتی کە جینۆســاید و رەشـکردنەوەیە، هەرگیز ناشێت، بە پێچەوانەوە پێویستە گەورە کەتنی لەم بابەتە ئەگەر کۆنیش بێت هەر بەســەر نەچێـت (عدم التقادم)، دیارە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش، بە بۆنەی تاوانبارانی شــەڕی دووەمەوە هەسـت و ئیدراکی بــەو مەســەلەیە کــردووە کاتێک کــە دەوڵەتــی ئەڵمانی بڕیارێکی دەرکرد و تێیدا سزای تاوانەکانی جەنگ و دژ بە مرۆڤایەتی لەسەر 'مارتن بورمانی'ی یاریدەدەری یەکەمی هیتلەر (کە ســزای لە ســێدارەدان بوو) و ئەوانەی تریش کــە لە گەڵی بــوون، هەڵگرت بەو بیانوو و پاســاوەی کە جێبەجێنەکردنی ســزایەکە و کەوتنی لەبەر ئەوەبووە کە (25) ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە و یاسای ئەڵمانی وای تێکست نووس کردووە[16]. کۆمەڵەی گشتی لە 1968/11/26 دا بـۆ یەکەمین جـار بە بڕیاری ژمـارە 2391 ( د – 23)، ڕێککەوتننامەی بە سەرنەچوونی تاوانەکانی جەنگ و دژ بە مرۆڤایەتی پەسند کرد، ئەوەش زیاتر لەبەر ترسناکیی ئەم تاوانانە و لەبەر ئەوەی هەموو ئەو بڕوانامە و جاڕنامە و ڕێککەوتننامانەی کە پێشــتر دەرچوون و بەتاوانەکانی جەنگ و (دژ بە مرۆڤایەتی) پەیوەسـت بوون، ماوەی بە سەرچوونیان دیاری نەکردبوو.

بەندی یەکەم لە ڕێککەوتننامەی ناوبراو زۆر بە ڕوونی

ئامــاژەی بەوە کردووە کە: (ئەم تاوانانەی خوارەوە هەر بــە ســەرناچن بە چاو پۆشــین لە کاتــی ئەنجامدانیان: ئـ - ........، ب – تاوانەکانــی دژ بــە مرۆڤایەتــی لــە کاتــی شــەڕدا بێت یان لە زەمەنی ئاشــتیدابێت کە پێناســەکەی لــە پێــڕەوی بنەڕەتــی دادگای نۆرمبێرگــی عەســکەریی نێودەوڵەتیدا هاتووە، کە لە 8ی ئابی 1945 دا دەرچووە کــە لە هــەردوو بڕیــاری کۆمەڵەی گشــتی 3 ( د – 1 ) کــە لــە 1946/2/13 دا دەرچــووە و 95 ( د – 1) کــە لــە 11ی کانونــی یەکەمــی 1946 دا دەرچــووە، تەئکید کراوەتەوە و دەرپەڕاندن بەهۆی دەســدرێژی چەکدارانە یــان داگیرکردنــەوە و کارەکانــی دژ بــە مرۆڤایەتــی کە بەرەنجامی سیاســەتی ئەپارتهاید و تاوانی جینۆساید کە پێناســەکەی لە رێککەوتننامەی ســاڵی 1948 دا هاتووە ســەبارەت بە قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزادان لەسەری، ئەگەرچیش ئەو کارە ناوبراوانە کار و کەلێنێک لە یاســای نێــو خۆی ئــەو دەوڵەتەی کــە تاوانەکەی لێ کراوە، نەکەن ........).

ئــەوەی لــە هەموویشــی پــڕ بایەختــرە ئەوەیــە کە لە جێبەجێکردنی مەبدەئی (بە سەر نەچوون – عدم التقادم) لە بــواری یاســای ســزایی نێودەوڵەتیدا (چ لــە قۆناخی دادگاییکــردن یا ســزادانەوە بێت) مەبدەئی – یەکســانی لــە بەرامبەر یاســادا کاری پێکراوە و هیچ کەســێکی لێ

هەڵنابوێـردرێ. روونتـر بڵێین، ئەگەر یاسـای نێوخۆی دەوڵەتـان هەندێک تاوانباری وەک سـەرۆکی دەوڵەت یا ئەوانەی نەخشەی سیاسەتی دەوڵەت دەکێشن، لە وەزیر و دەسـەڵاتدارانی تر یا بەر لێپرسـینەوە و سـزا ناکەون یا دادگاییەکەیان بەرێورەسـمێکی تایبەتی یا رووکەشیدا تێدەپەڕێ، بەڵام ئەنجامدەرانی تاوانی جینۆسـاید (یاسای نێودەوڵەتی) لە هەر پلەو پایەیەک دابن یا ئەگەر کەسانی ئاسـایی بـن ئـەوا هەموو بە بـێ جیاوازی لـە بەرامبەر دادگادا یەکسـان و هاوشـانن، چونکە تاوانـی وا گەورە هەر لە دەست حوکمڕان و زەبر بەدەستان دێت.

ئـەوەش بەنـدی (4) لـە رێککەوتننامـەی لەنێوبردنـی جینۆسـاید تەئکیدی لێکردۆتەوە و شـەرعیەتی یاسـایی بەوە داوە کە ئەنجامدەرانی ئەم تاوانە چ دەسـەڵاتدارانی دەستووری بن یا کارمەندە گشتییەکان یاخود تاقەکەسان بن، وەک یەک سزا دەدرێن. هەروابێتەوە بەندی دووهەم لە رێککەوتننامەی بەسەرنەچوونی تاوانەکانی جەنگ و دژ بە مرۆڤایەتی، لە هەمان جەختکردنەوەدا بەڵام رۆشـنتر دەقنووسـی ئەمەی کردووە. بەو پێیە (سـەدام حسێن) و دارو دەسـتەکەی کە حوکمی رژێمەکەیان راگرتووە و لە ماوەی زیاتر لە بیسـت ساڵ لە دانان و داڕشتنی نەخشە و پلانی جینۆسایدکردنی هەمەجۆرەی کورد بەشداربوون و لە جێبەجێکردنیشـیدا هەمدەم وەک کارکردەی ئەسڵی

و پشـــکدار رۆلی ســـەرەکی و بەرچاویـــان هەبووە وەک : ئەندامانی مەجلیســـی قیادەی ســـەورە و قیادەی حیزبی بەعـــس و زۆربەی وەزیرەکان و مەجلیســـی تەشـــریعی و تەنفیـــزی مەنتەقـــەی حوکمـــی زاتـــی و موخابـــەرات و ئیستخباراتی عەسکەری و ئەمنی عام و خاص ..... هتد.

ئەوانە چ ئێســـتا کە لە تەختـــی حوکمڕانین، چ وەختێکی تر کە لە حوکم نامێنن، دوای دەستنیشانکردنی یاساییان، تاوانی جینۆســـایدیان لێ بەســـەر ناچێت و لەبەر ئەوەی تەبیعەتـــی تاوانەکـــە جیهانییـــە، ئەگـــەر لەهـــەر کوێیەکی دنیاش بن، لە ڕێگای ئالیکاری و هەرەوەزی دەوڵەتانەوە دەگیرێن و دادگایی و سزا دەدرێن. بەپێی بەندی (1) یش لـــە جاڕنامـــەی پەنابەریی ئیقلیمی کە لـــە 1967/12/14 دا دەرچـــووە، نابێت هیـــچ دەوڵەتێک مافـــی پەنابەریی و داڵدەدان و هەچ کەســـێک بدەن کە شک و گومانی ئەوەی لێدەکرێ تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی (جینۆساید) و ئیدیکەی ئەنجامدابێـــت/ بنەمـــای (7) لـــە بنەماکانـــی هاریـــکاری نێودەوڵەتی لە بەدواداچوون و تەسلیمکردنەوە و سزادانی کەســـانی تاوانبار بـــە ئەنجامدانـــی تاوانەکانـــی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی 1973/2/3.

## پەراوێزی پارەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم

(1) د.حسنين ابراهيم صالح عبيد، الجريمة الدولية، ل269.

(2) بيار سـانية، فلنمض معا نحو انشـاء المحكمة الجنائية الدوليه، رۆژنامەی الحياة-ی لەندەنی ژمارە 11906 لە 1995/9/27.

(3) الدكتـور عبدالوهاب حومد، دراسـات معمقه فـي الفقه الجنائي المقارن، ل119/118.

(4)بيار سانيه، هەمان وتار و هەمان رۆژنامەی پێشووتر.

(5) حقوق الانسان، اسهامات على طريق تقديم صدام حسين واركان نظامه لمحاكمة دولية، ژمارە (26)، نيسان 1993، ل7.

(6) بيار سانيه، سەرچاوەی پێشوو.

(7) حقوق الانسـان، مشـروع اتهام لصدام حسـين واركان النظام العراقي، بەشی حەوتەم، ژمارە (35)، شوباتی 1994، ل7.

(8) خەڵكی كوردسـتان، ئەوانەی لەنيسـان و مايسی 1991 گوێ رادێری رادیۆ جیهانییەکانی وەک دەنگی ئەمەریکا و لەندەن و مۆنتی کارلۆ بوون، بەتەئکید تێبینی ئەو مەسەلەیان کردووە.

(9) الانسان، اسهامات على طريق تقديم صدام حسين واركان نظامه لمحاكمة دولية، ژمارە (26) نيسـانی 18993، ل6. هەروەها بنۆڕە: د.عبدالوهاب حومد، الاجرام الدولي، ل150-151.

(10) الدكتور حامد سـلطان: القانون الدولي العام في وقت السـلم، دەزگای (النهضة العربية) چاپی شەشەم، قاهیرە 1976 ل308.

(11) د.علـي حسـين خلف، الوسـيط في شـرح قانـون العقوبات، ل232.

(12) هەمان سەرچاوە ل240.

(13) د.عبدالوهاب حومد، الاجرام الدولي، ل244.

(14) هەندێک تاوان هەن (مرۆڤایەتی) بەشێوەیەکی گشتی لەئەنجامدانی زەرەرمەند دەبێت و ئەمن و ئاسایشی جیهان تێکدەدات، وەک تاوانەکانی سەدام و دارو دەستەکەی و تاوانەکانی بازرگانیکردن بە ئافرەت و منداڵ و مێرمنداڵ بۆ کارو ئابرووبەری و تێکدانی تۆڕو هۆیەکانی گەیاندن و بڵاوکردنەوەی مادده سڕکەرەکان (المخدرات) و...... بەو پێیەش دادگایی کردنی ئەنجامدەرانی دەکەوێتە ئەستۆی هەر دەوڵەتێکی کە تاوانباران دەسگیر دەکات، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی مەفهووم و مانای (الاختصاص) یا (الاختصاص الشامل)، بڕوانە: د.عباس الحسني، شرح قانون العقوبات، ل40 بەدواوە.

(15) ئەوەتا وەزیری دادی ڕژێم کە یەکێکە لەنوێنەرو سەرانی تاوان پۆشەکانی دیکتاتۆر، بەخودی خۆی دانی بە مومارەسە کردنی ئازارو ئەشکەنجەدان ناوە لە زیندانەکانی عێراقدا (دیارە کە داننانیش شای هەموو بەڵگەکانە)، بەڵام ئەم وەزیرە پاساویشی هێناوەتەوە بەوەی کە ئەشکەنجەدانەکان فەردی-یە، واتا جەماعی و بۆ ئیبادەکردن نییە)، بە ڕای ئەو نەبۆتە نەهج و دیاردە و ئەنجامدەرانی، واتە ئەمن وموخابەراتەکەی زۆر جار وا ڕێککەوتووە کە سزادراون، بڕوانە (حقوق الانسان) ژمارە 35، 1994، ل4.

(16) د.حسنین ابراهیم صالح، ل142.

# کۆتایی و دەرئەنجام

دوای ئەوەی ئەم کورتە لێتوژینەوەیەمان لە چوارچێوەی چەند پارو پشک و لق و پۆلینی دیکەدا خستە ڕوو، هەندێ ڕاستی نەگۆڕ و حاشــاهەڵنەگرمان لێ ڕۆشنتر بووەوەو بڕێکی ئەوەی هەڵمــان هێنجا ئەو دەرەنجامانە بوون کە: دارو دەســتەی ڕژێمی دیکاتۆری بەغدا سەرەڕای هەموو پلان و پیلانی گڵاو و نەخشەی بەروەختی بەرنامەڕێژیی بۆ جینۆســاید و ئیبادەکردنی کورد لــە هەموو ئالێکەوە: (جەســتەیی بە کۆمەڵ، ئێســکەرە و لەسەرەخۆ، زمان و کەلتوور و هزر و بیرکردنەوەی سیاسی و ئارکیۆلۆجیا و مێژوو و بونیادی سۆسیۆلۆجی و دابونەریت و ژێرخانی ئابــووری و داڕشــتە و هەیکەلــی گونــد و دیهاتــەکان، ئەســنوگرافیا و جوگرافیــا و ... هتــد) وێــڕای تێکــدان و خاپوورکردنــی ئەوەی رابرد، نەک هەر نەشــیا ئەو گەلە ئیبادە و رەش بکاتەوە، بەڵکو بڕوای ئەو میللەتەی بە مافە ڕەواکانی خۆی چەســپاو و جێگیرتــر کرد و ڕەوڕەوەی مێــژووی بەرەو پێشــتر چوو. ئەو نەتەوە ڕەســەنەی کە

شوێن پێی بە قووڵایی مێژووی شارستانێتی و مرۆڤایەتی و هەمـوو بەهـا پیرۆزەکانە : لـەو رەفتـاری ئیبادەیەی کـە رژێم هەموو رێگە و وەسـیلەیەکی وەحشـیگەرانەی بروانەکـردەی تێدا بەکار هێنـا بە نیازی لەنێوبردنی نەک هـەر لە بەین دانەچوو، بەڵکو لە چلەپۆپەی جێبەجێکردنی سیاسـەتی تارومارکردنیـدا بەگژ ئەو رژێمـەدا چووەوە و لێـی راپەڕی و لـە 1991 دا رقـی کەڵەکەبووی زوڵم و سـتەمی چەندین سـاڵەی ئەو رژێمەی پێدا دارشـت و لەسـەر بەشـێکی گەورەی خاکـی خۆیدا وەدەرینـا ......
لەوەدا هەر میللەتێکی رەسەن و رەگاژۆ، لەژێر هەر زەبر و فشـارێکی نەهێشـتن و ئیبادەکردنـدا مومکیـن نییە لە نێوبچێ و بسڕێتەوە، بەڵکو ئەمە رشتتر و مکومتری دەکا و بروایـی بە هێزتـر دەکات . بۆیە تاکـە (رەنگاڵەیی ئەو بەرژەوەندییە سیاسـییانە) لە پاڵ ئەوەی کە نەیهێشتووە بروانامە نێودەوڵەتییەکان بەکار و جێبەجێ بکرێن (بەپێی پێویسـتی سیاسـەت نەبێت) لێیش نەگەڕاوە کە هەچ لەو رێکخراوانەی مافي مرۆڤ وەک (ئەمنستی ئەنترناشنال و میدڵ ئیست وۆچ .. هتد) دەوریان هەبێت لە کەمکردنەوەی موعاناتـی گەلانـی دنیا و رێزگرتن لـە مافەڕەواکانیان و ئەوەی ئەنجامیان دابێت بە هیممەتی خۆیان بووە.
سـەدام حسێن و دار و دەستەکەی کە تاوانباری جەنگ و دژ بـە ئاشـتی و مرۆڤایەتین، کارێکـی وایان بە کورد

کـرد لە مێژوودا کەم نەزیـرە و وەختێکیش کە ئەو گەلە راپەڕی و دەسـەلاتی نیشتمانی خۆی بەرپا کرد، رێژێکی ئەوتۆی لە قوربانییانی جینۆساید و کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکـراوان نەنا کە بە سـەدان هـەزار دەبن. هەر بە تەنهـا 182 هەزاری ئەنفالـەکان و (8) هەزار بارزانی و دەیـان هـەزاری فەیلییەکان بە قەدەر ژمـارەی زۆر لەو دەوڵەتانە دەبێ کە ئالاو و سـەروەرییان هەیە و ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکانن و لە سەرئەوە:

لە سەرەتای ئابی 1996 دا، بە پێی گوتەی رووسەکان 130 کـەس و بەپێی وتەبێژی چیچانییەکان (350) کەس لە رووسـەکان لەسـەر خاکی چیچاندا کوژران، بۆ ئەوە (دەوڵەتی رووسیای 150 ملیۆن کەسە) بەهیینامەی (الحداد الرسمی) لەسەر رووبەری 17 ملیۆن کیلۆمەترەی خۆیدا راگەیاند و ئالای بۆ دانەواندن، کوێت بۆ ئەو (600) دیل و ئێخسـیرەی خۆی چەندین دامودەزگای دەوڵەتی تەرخان کردووە و یەکبینە لە هەوڵی دۆزینەوەی چارەنووسـیان دایـە کەچی نە (بەرەی کوردسـتانی) و نـە (پەرلەمان و حکوومەتی هەرێم) وەک پێویسـت لە چارەنووسـی ئەو سـەدان هـەزارەی نەکۆڵییـەوە و رێزی لە کەسـوکاری ئەنفال و شەهیدان وەک پێویستیش نەگرت و دامودەزگای یاسایی و پێویست و لە باری بۆ تەرخان نەکردن!! ....

خودی رێککەوتننامەی لە نێوبردنی جینۆساید و سزادان

لەســەری 1948 کــە ئێمە پلان و نەخشــەی ئەو کورتە باســەمان لەســەر ئەو بناغەیە هەڵێناوە، کــەم و کورتی تێدایە، نەخوازەڵا لە ڕووی دیاریکردنی سزای تاوانکاران و دامەزراندنی دادگایەکی ســزایی نێودەوڵەتی بەردەوام، هەروەها لە ڕووی دەستنیشانکردنی ئەو تاوان و وەسیلە و ئامرازانــەی جینۆســاید کە ڕژێمی بەغــدا ئیبداعی تێدا کردوون و لە کاتی شەڕی دووەمی گێتیدا بوونیان نەبووە. گەورەتریــن کــەم و کورتی ئــەو ڕێککەوتننامەیە ئەوەیە کــە بــواری جێبەجێکردنی نییــە .. تەنها لــە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکاندا نەبێت ...

بۆیە تاکە ڕێگا، بە ئاشــتی بیرکردنەوە و ئیستیعابکردن و بەپیرەوەچوونــی مافی ڕەوای گەلانە بەپێی دەســتوور و یاســا و بڕوانامــە نێودەوڵەتییەکانــی لەمــەڕ مافەکانی مرۆڤ.

ئەو پەیماننامە و جاڕنامە و پرۆتۆکۆل و ڕێککەوتننامە هەمەلایەنانــەی کــە زۆربــەی دەوڵەتانی دنیــا چوونەتە ڕیزییــەوە و بڕواییــان پێــداوە، یا ئیمزایان کــردووە، بە تایبــەت دەوڵەتــە زلهێزەکان کــە خۆیان بــە بەرپرس و زامنــی ئاســایش و ئارامــی جیهان دادەنێــن، هیچ ڕێز و بەهایەکی یاســایی و غەیرە یاسایی بۆ ئیمزاکانی خۆیان دانەنا و حەقیقەتی ئەو بڕوانامە نێودەوڵەتییانەیان دەقەبەر بەرژەوەندی و واقیعی سیاسەتە گۆڕاوەکانیان کرد.

ئەوەتا لە 1988 دا ژەهرباران و ئەنفالکردن وئیبادەکردنی کورد گەیشتۆتە ئەوپەڕی چلەپۆپەو ئەستێرە دەسکردەکانی ئەورووپا و ئەمریکاش وێنەی کارەساتەکان بۆ دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتانە دەگوێزنەوە کە بە هەزاران قوربانی لە کیمیا لێدراوەکان دەپێکرێن و بریندار دەبن و بەلادا دێن، کە ئەمە وەک (شەهادەیەکی عەینی)، یەکێکە لەو بەڵگە بنەڕەتی و گرینگانەی کە یاسای ئەنگلۆسکسۆنی متمانەی پێدەکا و پشتی پێدەبەستێ، جگە لەوەی ئەم تاوانە ژێر پێ خستن و ئیهانەکردنی هەموو یاسا و دەستوور و بڕوانامە نێودەوڵەتییەکانە، کەچی خڕ ئەو وڵاتانە لە ئاست ئەنجامدانیدا کەڕ و کوێر و کاس بوون، هۆیەکەیشی وەک دیارە ئەو کات بەرژەوەندییان لەگەڵ رژێمی بەغدادا بوو.

بەکارهێنانی چەکی کۆکوژی کیمیاوی لە دژی کورددا، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی وەهۆش خۆ هێنایەوە، بەلام نەک بۆ ئێمە، تەنانەت بەقەدەر ئەو وەبیر خستنەوەیەش کۆنگرەی پاریس کە لە نێوان 7 تا 11/ ینایر 1989 بۆ چەکی کیمیاوی تەرخانکرابوو و تازە کورد ئەو چەکەی وێ کەوتبوو، نەباسی قوربانییەکانی کوردی کرد، نە ئیدانەی رژێمی کرد و تەنانەت ناویشی نەهێنا . کەچی دوای شەڕی کەنداوو داگیرکردنی کوێت لە لایەن رژێمی عێراق و تێکچوونی هاوسەنگی و شیرازەی ئابووری ئەو

دەوڵەتانــە، بەرژەوەندییەکانیان لــە دژی رژێمدا گۆڕا و، ئەگــەر هەرچییەکی بۆ کــورد کرابێت یــا گوترابێت، لەو روانگەیە و لە ئاکامی کاریگەریی کارەســاتەکەیەوە بووە لەسەر رای گشتی و شەقامی ئەو دەوڵەتانە .

# پاشبەند

وەک چەند بەڵگە و بڕوانامەیەکی سەلمێنەر بۆ ناوەڕۆک و دەقی ئەم کورتە لێتوێژینەوەیە و بە مەبەستی پتر زانیاری و ڕۆشنایی خستنە سەر بابەتەکە بە پێویستمان زانی ئەو پاشبەندە ئامادە بکەین.

# چەند بڕوانامەیەکی نێودەوڵەتی

**کە لە نووسینی تێکستی باسەکەدا وەک بناغەیەک پشتی پێ بەستراوە ئەوانیش: ڕێککەوتننامەی لەنێوبردنی جینۆساید و سزادان لەسەر ئەنجامدانی ڕێککەوتننامەی بەسەرنەچوونی تاوانەکانی جەنگ و دژ بە مرۆڤایەتی و چەند بنەمایەکی نێودەوڵەتی...**

## ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی تاوانی کۆمەڵکوژی و سزادان لەسەر ئەنجامدانی

بە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 260 ئەلیف ( د – 3) کە لە 1948 دا دەرچووە، متمانەی پێدراوە و بۆ واژووکردن و باوەڕپێ پێدان یان چوونەریز خراوەتە روو، مێژووی سەرەتایی جێبەجێکردن: 12 ی کانونی دووەمی 1951 بەپێی بەندی سێزدەمین.

**لایەنە ڕێککەوتووەکان:**

کە دەبینن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە بڕیارێکی خۆی 96 (د1-) کە لە 11ی کانونی یەکەمی 1946 دا دەرچووە، جاڕی داوە کە جینۆساید تاوانێکە بەپێی یاسای نێودەوڵەتی دەگەڵ گیانی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئارمانجەکانیدا ناکۆکە و دنیای باژێرڤانیی مەحکوومی

دەکات.
کەدانیش دەنێن بەوەی کە جینۆساید لە هەموو چاخەکانی مێژوودا، زەرەر و زیانی گەورەی بە مرۆڤایەتی گەیاندووە. بە باوەڕی بوونیشیان بەوەی کە رزگارکردنی ئادەمییەت لــە بابەتی وەک ئەو پەتایە تووشــە ئالیکاری نێودەوڵەتی گەرەکە.
**لەسەر ئەمانەی خوارەوە رێک دەکەون:**
**بەندی یەکەم**
لایەنە رێککەوتووەکان بڕوایی دێنن بەوەی کە جینۆساید ئەگەر لە رۆژانی ئاشــتی یان لە کاتی شــەڕدا ئەنجامدرا بێــت، تاوانێکــە بەپێــی یاســای نێودەوڵەتــی و پەیمانــی قەدەغەکردنی و سزادان لەسەر ئەنجامدانی دەدەن.
**بەندی دووهەم**
لــەم رێککەوتننامەیــەدا جینۆســاید هــەر یەکێــک لەو کارانەی خوارەوە دەگەیەنێ کە بەمەبەستی وێرانکردنێکی گشــتگریی یان بەشگریی گرووپێکی نەتەوەیی یا ئیسەنی یــان رەگەزایەتــی یاخــود ئایینــی ئەنجامدرابێــت بــەو سیفەتانەی خوارەوە:
( أ) کوشتنی چەند ئەندامێکی کۆمەڵێک.
(ب) ئازار گەیاندنی خەتەرناکانەی جەســتەیی یا گیانی ئەندامانی کۆمەڵێک.
(جـ) هێنانە ژێر باری کۆمەڵێک بە دەســتی ئەنقەست بۆ

زرووفێکی گوزەرانی ئەوتۆ کە مەنزوور لێی تێکشکاندنی ماددیانەی گشتگریی یا بەشگریی بێت.

(د) سەپاندنی چەند تەگبیرێک، کە ببێتە هۆی منداڵ نەبوون (نەزۆکی) لەنێو کۆمەڵێکدا.

(ە) گواستنەوەی منداڵان لە کۆمەڵێکدا بە زۆر بۆ کۆمەڵێکی تر.

**بەندی سێهەم**

لە سەر ئەو کارانەی خوارەوە سزا دەدرێت:

( أ) جینۆساید.

(ب) پیلانگێڕان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

(جـ ) دنەوتیغ تیخەدانی راستەوخۆ و بەئاشکرایی بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

(د) هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

(ە) پشکداریکردن لە جینۆساید.

**بەندی چوارەم**

ئەنجامدەرانی جینۆساید یا هەر یەکێک لەو کارانەی تر کە لە بەندی سێیەمدا ناوبراون، سزا دەدرێن، ئەگەر دەسەڵاتدارانی دەستووری یا کارمەندی،گشتیی یاخود تاقە کەسان بووبن.

**بەندی پێنجەم**

لایەنە رێککەوتووەکان هەر یەکێک و بەپێی دەستووری خۆی پەیمان دەدەن کە چەند تەگبیرێکی یاسایی پێویست

بکەن بۆ دەستەبەرکردنی پێڕۆکردنی ئەحکامەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە بە تایبەتیش دەقنووسکردنی چەند سزایەکی جینایی بەسوود و لەبار کە بەسەر ئەنجامدەرانی جینۆساید یا هەر یەکێک لەو کارانەی تر کە لە بەندی سێیەمدا ناوبراون، بسەپێنرێن.

**بەندی شەشەم**

کەسانی تاوانبار بە ئەنجامدانی جینۆساید یان هەر یەکێک لەوکارانەی تر کە لە بەندی سێیەمدا ناوبراون، دادگایی دەکرێن لەبەرانبەر دادگایەکی تایبەت لە دادگاکانی ئەو دەوڵەتەی کە کارەکەی لەسەرخاکەکەیدا ئەنجامدراوە، یان لە بەرامبەر دادگایەکی سزایی نێودەوڵەتیدا کە تایبەتمەندێتی هەبێت بە گوێرەی ئەوانەی لەلایەن ڕێککەوتوەکاندا دانی بە دەسەڵاتی داناوە.

**بەندی حەوتەم**

جینۆساید و کارەکانی تری ناوبراو لە بەندی سێیەمدا لە سەرئاستی تەسلیمکردنەوەی تاوانکاراندا، بە تاوانی سیاسی ناژمێردرێن، لایەنە ڕێککەوتوەکانیش لە حاڵی وادا پەیماندەدەن کە بەپێی یاساکانیان و پەیماننامە کار پێکراوەکان داوای تەسلیمکردنەوەکە جێبەجێبکەن.

**بەندی هەشتەم**

هەر یەکێک لە لایەنە ڕێککەوتووەکان بۆی هەیە کە داوا لە دامودەزگا تایبەتییەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان بکات کە

بەپێی بڕوانامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەوەی پێی باشە لــە ڕاو تەگبیــر بیکات، بــۆ قەدەغەکردن و لــە نێوبردنی کارەکانی جینۆســاید یان هەر یەکێک لــەو کارانەی تری نێوبراو لە بەندی سێهەم.

**بەندی نۆیەم**

ئەو ناکۆکییانەی کە لــە نێوان لایەنە ڕێککەوتووەکاندا دروستدەبێت سەبارەت بە لێکدانەوە یان پیادەکردن یاخود جێبەجێکردنی ئەو ڕێککەوتننامەوە، بەو ناکۆکیانەشــەوە کــە بەندن بە بەرپرســیارێتی دەوڵەتێک لە جینۆســاید یا هەر یەکێک لەو کارانەی تری ناوبراو لە بەندی ســێهەمدا لەسەر داوای هەر یەکێک لە لایەنە ناکۆکەکان بۆ دادگای دادی نێودەوڵەتی دەخرێنە ڕوو .

**بەندی دەیەم**

ئەو ڕێککەوتننامەیە کە لە بەڵگە و هێزدا دەقە ئیســپانی و ئینگلیزی و فەرەنســی و ڕووســی و چینییەکەی وەک یەکــن، بەرواری 9 ی کانونــی یەکەمی 1948 بەخۆیەوە هەڵدەگرێت.

**بەندی یازدەهەم**

ئــەم ڕێککەوتننامەیە تاکو 31 ی کانونی یەکەم 1949، بۆ واژووکردن ئالایە لەلایەن هەر دەوڵەتێک لە دەوڵەتانی ئەنــدام لەنەتەوەیەکگرتــووەکان و هــەر دەوڵەتێکیش کە ئەندام نەبێت و کۆمەڵەی گشتی بانگهێشتی واژووکردنی

کردبێت. ئـەم ڕێککەوتننامەیـەش پێویسـتە بڕوایـی پێبدرێت و دەقە بڕواپێدراوەکانیش بە ئەمینداری گشـتی نەتەوەیەکگرتووەکان دەسپێرێت. لە دوای یەکەمین ڕۆژی مانگی کانونی دووەمی 1950یشدا، هەر دەوڵەتێکی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکان و هەر دەوڵەتێکی کە ئەندام نەبێت و بانگهێشـتی ئەوە کرابێت کە لە سەرەوە ڕا ئاماژەی بۆ کرا، دەکرێ لایەنگیری ئەم ڕێککەوتننامەیە بێت. دەقەکانی چوونە ریزیش بە ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان دەسپێررێت.

**بەندی دوازدەهەم**

هەر لایەنێکی ڕێککەوتوو لە هەر کاتێکدا بۆی هەیە کەوا بکات پێڕۆکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە هەموو ئەو ئیقلیمانە بگرێتەوە کە لایەنی ڕێککەوتووی ناوبراو لە بەڕێوەبردنی پەیوەندییە دەرەکییەکانیدا لێی بەرپرسیارە، یاخود هەر کام لـەو ئیقلیمانە بگرێتەوە، ئەوەش بە هۆی پێ ڕاگەیاندنێک کە ڕووبەڕووی ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکانی دەکاتەوە.

**بەندی سێزدەهەم**

لـەو ڕۆژەی کە تێیدا سـپاردنی بیسـت دەقـی یەکەمی بڕوایـی پێـدان یان چوونەڕیـز تەواو بـوون، ئەمینداری گشتی بۆئەوە کۆنووسێک (محضر) ئامادە دەکا و دانەی بـۆ هەموو دەوڵەتێکی ئەنـدام لەنەتەوە یەکگرتووەکان و

بـۆ هەر دەوڵەتێکی نا ئەندامی ئامـاژە بۆ کراو لە بەندی (11) دا دەنێرێـت. جێبەجێکردنـی ئەو ڕێککەوتننامەیەش لە نۆهەدەمیـن ڕۆژی دوای بەرواری پێسـپاردنی دەقی بیسـتەمین لـە دەقەکانـی بڕوایـی پێـدان و چوونەڕیـز دەستپێدەکات، هەر بڕوایی پێدان یا چوونە ڕیزێکیش کە لە پاش ڕۆژی ناوبراودا دەکرێ لە نۆهەدەمین ڕۆژی دوای بـەرواری پێسـپاردنی دەقی بڕوایی پێـدان و چوونەڕیز کارپێدەکرێت.

**بەندی چواردەهەم**

ئـەم ڕێککەوتننامەیە بۆ ماوەی دەسـاڵ کارپێدەکرێت، کە لە مێژووی سـەرەتای کار پێکردنی دەسـت پێدەکات، دوای ئەوەیـش بۆ چەنـد ماوەیەکی یەک لـە دوای یەک کـە هەر ماوەیەکی پێنج سـاڵ دەخایەنێ، بە کارپێکراوی دەمێنێتەوە بە گوێرەی ئەو لایەنە ڕێککەوتووانەی کە پێش تەواوبوونی ماوەکە بە شـەش مانـگ بەلانی کەمەوە لێ نەکشـاونەتەوە، خۆ کێشـانەوەیش بەپێـی ڕاگەهاندنێکی دەسنووسـەوە دەبێت کە ڕووبەڕووی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێتەوە.

**بەندی پازدەهەم**

وەک بەرەنجامـی خۆکێشـانەوە ئەگـەر ئـەوە ڕوویدا کـە ژمـارەی لایەنەکانی ئـەم ڕێککەوتننامەیـە بۆ کەمتر لـە شـانزدە دابـەزی، کارپێکـردن بـەو ڕێککەوتننامەیە

لــە بــەرواری ســـەرەتای کارکــردن بـــە دوایەمینــی ئەو خۆکێشانەوانەیشەوە، نامێنێت.

**بەندی شازدەهەم**

هــەر لایەنێکــی رێککەوتــوو بۆی هەیە لە هــەر کاتێکدا داوایــەک بە بژاردەکردنی ئەو رێککەوتننامەیە پێشــکەش بــکات، ئەمەش بەپێی راگەهاندنێکی نووســراو دەبێت کە رووبــەڕووی ئەمینــداری گشــتی دەکاتــەوە و کۆمەڵەی گشتی یەکلاکردنەوەی ئەو پێنگاڤ هەڵێنانەی کە لەوانەیە ســەبارەت بەو چەشنە داوایانە پێویست بن، بە ئەستۆوە دەگرێت.

**بەندی حەڤدەهەم**

ئەمینداری گشــتی نەتەوە یەکگرتوەکان هەڵدەستێت بە خەبەرداركردنی گشــت دەوڵەتانی ئەندام و دەوڵەتانی نا ئەنــدام کە لــە بەندی یازدەهــەم ئاماژەیان بــۆ کراوە بە مانەی خوارەوە:

( أ) واژووکردن و بڕوایی پێدان و چوونەڕیز کە بەپێی بەندی یازدەهەم وەرگیراون.

(ب) رێککەوتی سەرەتای کارکردن بەو رێککەوتننامەیە بە پێی بەندی سیانزدەهەم.

(د) خۆکێشانەوەکە بەپێی بەندی چواردەهەم کراوە.

(ه) پووچەڵکردنەوەی ئەو رێککەوتننامەیە بەپێی بەندی پازدەهەم.

(و) ئاگادارکردنـــەوەکان کـــە بەپێی بەندی شـــازدەهەم کراوە.

**بەندی هەژدەیەم**

ئەسـڵی ئـەم ڕێککەوتننامەیـە بـە پارێزراوەکانـی نەتەوەیەکگرتووەکان دەسپێردرێت و دانەیەکی باوەڕپێکراو لـەو ڕێکەوتننامەیـە بۆ هەر یەکێک لـە دەوڵەتانی ئەندام لـە نەتەوە یەکگرتووەکان و بۆ هـەر یەکێک لەدەوڵەتانی نـا ئەندام کە لە بەندی پانزدەهەمـدا ئاماژەیان بۆ کراوە، دەنێردرێت.

**بەندی نۆزدەهەم**

ئەمینداری گشـتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵدەسـتێت بـە تۆمارکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە، لـەو بەروارەی کە جێبەجێکردنەکەی تێدا دەستپێدەکات.

## ڕێککەوتننامەی بە سەر نەچوونی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی

بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 2391 (د23-) کە لە 1968/11/26 دەرچووە، پەسند کراوە بۆ واژووکردن و بڕوایی پێدان و چوونەڕیز خراوەتە روو . مێژووی دەسپێکی جێبەجێکردن 1970/11/11 بەپێی بەندی هەشتەم.

### دیباچە

**دەوڵەتانی لایەن لەم ڕێککەوتننامەیەدا**

کە ئاماژە بە هەردوو بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکەن 3 (د1-) کە لە 13 ی شوباتی 1946 دا دەرچووە و 170 (د 2- ) کە لە 31 ی تشرینی یەکەمی 1947 دا سەبارەت بە تەسلیمکردنەوە و سزادانی تاوانکارانی شەڕ دەرچووە و بۆ بڕیاری 95 (د1-) کە لە 11ی کانونی یەکەمی 1946 دا دەرچووە، کە جەخت لەسەر بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی دەکاتەوە

کـە لە پێـڕەوی بنەڕەتی دادگای نۆرمبێرگی سـەربازیی نێودەوڵەتـی و لە حوکمــی دادگاکەدا دانی پێدانراوە و بۆ هــەردوو بڕیـاری 2184 (د – 21 ) کە لــە 12 کانونی یەکەمــی 1966 دا دەرچــووە و 2202 ( د – 21 ) کـە لە 16 کانونی یەکەمی 1966 دەرچووە و بە راشــکاوی دەقنووســی مەحکوومکردنی پێشــێلکردنی مافە ئابووری و سیاســییەکانی دانیشــتوانی ئەسـڵی وڵاتان کردووە لە لایەکــەوە، و لــە لایەکی تــرەوە سیاســەتی ئەپارتهایدی مەحکوومکردووە بەوەی کە دوو تاوانی دژ بە مرۆڤایەتین.
کــە ئاماژەیــش دەکەن بە هەردوو بڕیـاری ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی ســەر بە نەتــەوە یەکگرتووەکان 1074 دال ( د39- ) کــە لــە 28 ی تەممووزی 1965 دا دەرچووە و 1158 ( د – 41) کە لە 5ی ئابی 1966 دا دەرچووە، ســەبارەت بە سزادانی تاوانکارانی شەڕو ئەو کەسانەی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتییان ئەنجامداوە.
کــە تێبینیــش دەکــەن هەمــوو جاڕنامە رەســمییەکان و بڕوانامــە و رێککەوتننامــەکان کــە پەیوەنــددارن بــە راوەدوونــان و ســزادانی تاوانەکانی شــەڕ و تاوانەکانی دژ بــە مرۆڤایەتی لەهەر دەقێک لەســەر ماوەی بەســەر نەچوون خاڵین.
کــە دەشــبینێت کــە تاوانی شــەڕ و تاوانەکانــی دژ بە مرۆڤایەتــی خەتەرناکترینــی تاوانەکانــن لە یاســای نێو

دەوڵەتیدا.

بەقەناعەت هاتنیشیان بەوەی کە سزادانی کاریگەرانەی تاوانەکانی شـەڕ و تاوانەکانـی دژ بە مرۆڤایەتی کارێکی گرینگـە لـە دوورکەوتنەوە لـە روونەدانی ئـەو تاوانانە و پاراسـتنی مافەکانی مـرۆڤ و ئازادییـە بنەڕەتییەکان و هاندانـی بڕوایـی و چەسـپاندنی هەرەوەزگەلـی لـە نێـوان میللەتانـدا و پاڵپشـتکردنی ئاشـتی و ئاسایشـی نێودەوڵەتی.

کەتێدیتنیشـدەکەن هێنانی تاوانەکانی شەڕو تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی بۆ ژێر رکێفي بنەماکانی یاسای نێوخۆیی کـە پەیوەسـتن بـە بەسـەرچوونی تاوانە ئاسـاییەکان، نیگەرانییەکـی تونـد لـە لایـەن رای گشـتی جیهانییەوە دەورووژێنـێ لـە بەروەی کـە دەبێتە هۆی نەشـیان، بۆ راوەدوونان و سزادانی بەرپرسان لەو تاوانانە.

کەهەستیشـدەکەن بە پێویسـتی و لە باریی رابوون بە جەختکردنەوەی بنەمای بەسەرنەچوونی تاوانەکانی شـەڕ و تاوانەکانـی دژ بـە مرۆڤایەتی لە چوارچێوەی یاسـای نێودەوڵەتی و بەهۆی ئەم رێککەوتننامەوە و بەزامنکردنی پیادەکردنێکی گشتگیری جیهانی.

**لە سەرئەوەی دادێت رێک کەوتن :**

**بەندی یەکەم**

بە چاوپۆشین لە کاتی ئەنجامدانیان هیچ بەسەرچونێک

بەسەر ئەو تاوانانەی خوارەوەدا پیادە ناکرێت :
(أ) تاوانەکانی شــەڕ کە پێناسەکەی لە پێڕەوی بنەڕەتی دادگای نۆرمبێرگی سەربازیی نێودەوڵەتی کە لە 8ی ئابی 1945 دا دەرچووە و لە هەردوو بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتــەوە یەکگرتــووەکان 3 (د1-) کە لە 13 ی شــوباتی 1946 و 95 ( د – 1) کــە لــە 11ی کانونــی یەکەمــی 1946 دا دەرچووە! تەئکید کراوەتەوە بە تایبەتی (تاوانە خەتەرناکەکان ) کە لە ڕێککەوتننامەی جنێڤدا ژمێردراون کــە لــە 12 ی ئابــی 1949 بۆ پاراســتنی قوربانییەکانی شەڕ بەستراوە.
(ب) تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، چ لە کاتی شــەڕ یان لە کاتی ئاشتیدا ئەنجامدرابێت، کە پێناسەکەی بە پێڕەوی بنەڕەتــی دادگای نۆرمبێرگــی ســەربازیی نێودەوڵەتیــدا هاتووە کە لە 8 ی ئابی 1945 دا دەرچووە و لە هەردوو بڕیاری کۆمەڵەی گشــتی نەتــەوە یەکگرتووەکان 3 (د – 1) کــە لــە 13 ی شــوباتی 1946 و 95 ( د – 1 ) کــە لــە 11 ی کانونــی یەکەمــی 1946 دەرچــووە و تەئکید کراوەتــەوە و دەرکردن بەهۆی دەســتدرێژی چەکدارانە یــا داگیرکردن و کارەکانــی دژ بە مرۆڤایەتــی، ئەوانەی بەرەنجامی سیاســەتی ئەپارتهایدن و تاوانی کۆمەڵکوژی کە پێناسەکەی لە ڕێککەوتننامەی ساڵی 1948 دا هاتووە ســەبارەت بە قەدەغەکردنی کۆکوژی و ســزادان لەسەر

ئەنجامدانی ئەگەرچی ئەو کارە ناوبراوانە لاسەنگییەکی لەیاسای نێوخۆی ئەو وڵاتەی کە تاوانەکانی لێ ئەنجامدراوە، دروستنەکردبێت.

**بەندی دووهەم**

ئەگەر هەر تاوانێک لەو تاوانانەی کە لە بەندی یەکەمدا ناوبراون، ئەنجامدرا، حوکمەکانی ئەم رێککەوتننامەیە پیادە دەکرێت بەسەر نوێنەرانی دەسەڵاتی دەوڵەت و ئەو تاقەکەسانەی کە بە سیفەتی کارکردەی ئەسڵی یان هاوپشک را دەبن بە بەشداریکردن لە ئەنجامدانی هەر تاوانێک لەم تاوانانە یان بە دنەو تیخ تیخەدانی راستەوخۆی کەسانی دیکە لەسەر ئەنجامدانی یا خود ئەوانەی بۆ ئەنجامدانی پیلان دەگێڕن بە چاوپۆشین لە پلەی جێبەجێکردن و لەسەر نوێنەرانی دەسەڵاتی دەوڵەت، ئەوانەی بۆ ئەنجامدانی تاوانەکان، شلدەکەن.

**بەندی سێهەم**

دەوڵەتانی لایەن لەم رێککەوتننامەیەدا پەیماندەدەن کە هەموو تەگبیرێکی نێوخۆیی یاسایی و غەیرەز یاسایی پێویستبکەن بۆ ئەوەی.وابکرێت بەپێی یاسای نێودەوڵەتی کەسانی ئاماژەبۆکراو لە بەندی دووهەمی ئەم رێککەوتننامەیە تەسلیم بکرێنەوە.

**بەندی چوارەم**

دەوڵەتانی لایەن لەم رێککەوتننامەیەدا هەر یەکێک و

بــه پێی چەنــد ڕێورەســمێکی دەســتووری پەیماندەدەن بەکردنەوەی چەند تەگبیرێکی یاسایی یان غەیرەز یاسایی کە پێویست بێت بۆ زامنکردنی پیادەنەبوونی بەسەرچوون یا هەر تاوانێکی دیکە بەســەر تاوانەکانی ئاماژەبۆکراو لە هەردوو بەنــدی یەکەم و دووەمی ئەم ڕێککەوتننامەیە ج لــە ڕووی ڕاوەدوونانــەوە یا لە ڕووی ســزادانەوە و بۆ زامنکردنی پووچەڵکردنەوەی، ئەگەر هەبوو.

**بەندی پێنجەم**

ئــەم ڕێککەوتننامەیە هەتا 31 ی کانونی یەکەم 1969، بــۆ واژووکردنــی هــەر دەوڵەتێکــی ئەنــدام لــە نەتەوە یەکگرتووەکان کراوەیە، یاخود بۆ ئەندامانی هەر ئاژانسێک لە ئاژانســە پســپۆڕەکانی نەتەوە یەکگرتــووەکان یان بۆ ئاژانســی نێودەوڵەتــی وزەی ئەتۆمی و هــەر دەوڵەتێک لــە دەوڵەتانی ئەنــدام لە پێڕەوی بنەڕەتــی دادگای دادی نێودەوڵەتــی و هــەر دەوڵەتێکی تر کە کۆمەڵەی گشــتی نەتــەوە یەکگرتــووەکان بانگهێشــتی کردبێــت کــە ببێتە لایەنێک لەم ڕێککەوتننامەیەدا.

**بەندی شەشەم**

ئــەم ڕێککەوتننامەیــە بڕوایــی پێدەدرێــت و دەقەکانی بڕوایی پێدان بە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەسپێردرێت.

**بەندی حەوتەم**

ئــەم ڕێککەوتننامەیە بۆ هاتنەڕیــزی هەر دەوڵەتێک لەو دەوڵەتانــەی لــە بەندی پێنجەمــدا ئاماژە بۆ کــراو، ئاڵایە و دەقەکانــی هاتنــە ڕیــز بــە ئەمینــداری گشــتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەسپێردرێت.

**بەندی هەشتەم**

(1) ئــەم ڕێککەوتننامەیــە لــە نۆهەتەمیــن ڕۆژی دوای بەرواری سپاردنی دەقی دەیەم لە دەقەکانی بڕوایی پێدان یا هاتنە ریز بە ئەمینداری گشــتی نەتەوە یەکگرتووەکان، کاری پێدەکرێت.

(2) ئــەم ڕێککەوتننامەیــە بــە گوێــرەی هەر یــەک لەم دەوڵەتانــەی کە بڕوایــی پێدەدا یا دەچێتــە ریزیەوە پاش ســپاردنی دەیەمین دەقی بڕوایی پێــدان یا چوونە ڕیز لە نۆهەتەمین ڕۆژی کە دوای بەرواری بڕوایی دانی دەوڵەتەکە یا چوونە ڕیزی بۆ ڕێککەوتننامەکە، کارپێدەکرێت.

**بەندی نۆیەم**

(1)هــەر لایەنێکــی ڕێککەوتــوو بــۆی هەیــە لــە هــەچ کاتێکدا دوای تێپەڕبوونی دەســاڵ بەســەر کارکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیــە داوای بژاردەکردنــی پێشــکێش بــکا و داوایەکە بە ڕاگەیاندنێکی نووسراو دەبێت کە ڕووبەڕووی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێتەوە.

(2) کۆمەڵەی گشتی ئەو هەنگاوانە یەکلایی دەکاتەوە کە

ڕەنگە لە بابەتی وەک ئەم داوایە پێویست بە هاوێژتنیان بکات.

**بەندی دەیەم:**

(1) ئەم ڕێککەوتننامەیە بە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەسپێررێت.

(2) ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان رادەبێت بە ناردنی وێنەی بڕواپێدراو لەم ڕێککەوتننامەیە بۆ هەموو دەوڵەتانی ئاماژە بۆکراو لە بەندی پێنجەم.

(3) ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵدەستێ بە ئاگادارکردنەوەی هەموو دەوڵەتانی ئاماژە بۆکراو لە بەندی پێنجەم، بەوانەی خوارەوە:

( أ) واژووەکانی سەر ئەم ڕێککەوتننامەیە و دەقەکانی بڕوادان و چوونە ڕیز بە پێی بەندەکانی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم.

(ب) بەرواری کارکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە بە پێی بەندی هەشتەم.

(جـ) نامە هاتووەکان بە پێی بەندی نۆیەم.

**بەندی یازدەهەم**

ئەم ڕێککەوتننامەیە کە لە بەڵگە و هێزدا دەقە ئیسپانی و ئینگلیزی و ڕووسی و چینی و فەرەنسییەکەی یەکسانن، بەرواری 26 ی تشرینی دووەمی 1968 بەخۆیەوە هەڵدەگرێت.

# بنەماکانی ئالیکاری نێودەوڵەتی لەبەدواداچوون و گرتن و تەسلیمکردنەوە و سزادانی کەسانی تاوانبار بە ئەنجامدانی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی

**بە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 3074 (د – 28 ) کە لە 3 ی کانونی یەکەمی 1973 دا دەرچووە.**

**کۆمەڵەی گشتی :**

کە ئاماژە دەکا بۆ بڕیاری خۆی 2583 (د24-) کە لە 15 ی کانونی یەکەمی 1969 دا دەرچووە بە بڕیاری خۆی 2712 ( د25-) کە لە 15ی کانونی یەکەمی 1970 دا دەرچووە و بڕیاری خۆی 2840 (د26-) کە لە 18 ی کانونی یەکەمی 1971 دا دەرچووە و بڕیاری خۆی 3020 ( د- 27 ) کە لە 18 ی کانونی یەکەمی 1972 دا دەرچووە.

کە ڕەچاویش دەکات هەبوونی پێویستییەکی تایبەت بۆ ئیجرائات وەرگرتن لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەپێناو

دابینکردنی راوەدوونان و سزادانی کەسانی تاوانبار بە ئەنجامدانی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی.
کە تەماشایشی کردووە لە پرۆژەی بنەماکانی ئالیکاری نێودەوڵەتی لە بەدواداچوون و گرتن و تەسلیمکردنەوە و سزادانی کەسانی تاوانبار بە ئەنجامدانی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی.
رایدەگەیەنێ کە نەتەوە یەکگرتوەکان بە پێی ئەو بنەما و مەبەستانەی کە لە بڕوانامەکەدا دیاری کراون و پەیوەستن بە پشتگیریکردنی ئالیکاری نێوان دەوڵەتان و پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەو بنەمایانەی خوارەوە بۆ هاریکاری نێودەوڵەتی لە بەدوادا چوون و گرتن و تەسلیمکردنەوە و سزادانی کەسانی تاوانبار بە ئەنجامدانی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی رادەگەیێنێ :
(1) تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی لە هەر کوێیەکدا ئەنجامدرابن، جێگای لێکۆڵینەوەیە و، ئەو کەسانەی کە بەڵگەی ئەوەیان لەسەر هەیە کە تاوانە ناوبراوەکانیان ئەنجامدابێت، جێگای بەدواداچوون و وەستاندن (توقیف) و دادگایی کردنن، و ئەگەر تاوانبار دەرچوون، سزادەدرێن.
(2) هەر دەوڵەتێک مافي دادگاییکردنی هاوولاتیانی

خۆی هەیە بە هۆی تاوانەکانی شەڕ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی.
(3) دەوڵەتان دوو لایەنە و چەند لایەنە ئالیکاری لەگەڵ یەکتردا دەکەن لە پێناوی وەستاندنی تاوانەکانی شەڕ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی و روونەدانی و لەسەرهەردوو ئاستی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی، چەند تەگبیرێکی پێویست بۆ ئەم مەبەستە دەکەن.
(4) دەوڵەتان یارمەتی یەکتر دەدەن لە بەدواداچوون و گرتن و دادگایی کردنی ئەوانەی گومانیان لێدەکرێت کە بابەتی وەک ئەم تاوانەیان ئەنجامدابێت و سزادانیان ئەگەر تاوانبار دەرچوون.
(5) ئەو کەسانەی کە بەڵگەی ئەوەیان لەسەرە کە تاوانەکانی شەڕ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتییان ئەنجامدابێت، دەدرێنە دادگا و سزا دەدرێن، ئەگەر تاوانکار دەرچوون، ئەمەش وەک بنەمایەکی گشتی لەو وڵاتانەی کە تاوانەکانیان تێدا ئەنجامداوە و لەم بارەیەوە دەوڵەتان لەهەرچییەکی کە پەیوەندی بەتەسلیمکردنی ئەو کەسانەوە هەبێت ئالیکاری یەکتر دەکەن.
(6) دەوڵەتان هاوکاری یەکتر دەکەن لەکۆکردنەوەی ئەو بەڵگە و زانیارییانەی کە بۆیان هەیە یارمەتی رەپێشکردنی کەسانی لە برگەی (5) ی سەرەوە ئاماژە بۆ کراو بدات بۆ دادگایی کردن و ئەو زانیارییانە ئالوگۆڕییان

پێدەکرێت.

(7) بەپێی حوکمەکانی بەندی (1) لە جاڕنامەی پەنابەریی ئیقلیمــی کە لــە 14 ی کانونی 1967 دا دەرچووە، نابێت دەوڵەتان پەنای هیچ کەسـێک بدەن کــە گومانی تەواوی لێدەکرێــت بــە ئەنجامدانی تاوانی دژی ئاشــتی یا تاوانی جەنگ یاخود تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی.

(8) دەوڵەتان هیچ تەگبیرێکی یاسایی (تشریعی) و غەیرەز یاســایی ناکەن کە لەوانەیە کارتێکردنێکی سـلبی بەسەر ئــەو ئیلتزامــە نێودەوڵەتییــەوە تێدابێت بە ئەسـتۆیانەوە گرتووە، لــەوەی پەیوەندداره بە بەدواداچوون و گرتن و تەسلیمکردنەوە و سزادانی کەسانی تاوانکار بە تاونەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی.

(9) کاتێــک دەوڵەتان هاوکاری یەکتر دەکەن لە پێناوی بەدواداچوون و گرتن و تەسلیمکردنەوەی ئەو کەسانەی کــە بەڵگەی ئەوەیان لە دژدا هەیە کە تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتییان ئەنجامدابێت و سزادانیان ئەگەر تاوانبار دەرچــوون، بەپێی حوکمەکانی بڕوانامەی نەتەوەیەکگرتــووەکان و جــاڕی بنەماکانــی یاســایی نێودەوڵەتی پەیوەســتدار بە پەیوەندییەکانی دۆســتایەتی و ئالیــکاری نێوان دەوڵەتــان، بەپێی بڕوانامــەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵسوکەوت دەکەن.

نموونەی نـاوی ئەو گوند و ناوچانەی کە لە ئابـی 1988دا و لەمـاوەی تەنهـا پێنج ڕۆژدا وەبـەر هێرشـی دڕندانـەی چەکـی کۆکوژی کیمیایی ڕژێم کەوتوون:

| ناوی ناوچەو گوندەکان | مێژووی هێرش کردنەکە |
| --- | --- |
| (1) وەرمیلی /بەرواری بالا /ئامێدی | 25 / 8/ 1988 |
| (2) بابیرێ /بەرواری بالا /ئامێدی | 25 / 8 / 1988 |
| (3) کەرەکرە / بەرواری بالا / ئامێدی | 25/ 8 / 1988 |
| (4) جەقەلا / بەرواری بالا/ ئامێدی | 25 /8/ 1988 |
| (5) هێسی/ بەرواری بالا / ئامێدی | 25/ 8/ 1988 |
| (6) ئێکماڵە /بەرواری بالا / ئامێدی | 25/ 8/1988 |
| (7) ئاسهێ/ بەرولری بالا / ئامێدی | 25 / 8/ 1988 |
| (8) مزسکا/ بەرواری بالا / ئامێدی | 25 / 8/ 1988 |
| (9) تۆشەمبیک / بەرواری بالا / ئامێدی | 25/ 8/ 1988 |
| (10) بازێ / بەرواری بالا / ئامێدی | 25/ 8/ 1988 |
| (11) مێرگا چیا / بەرواری بالا / ئامێدی | 25/ 8/ 1988 |
| (12) کانی بەلاف / بەرواری بالا / ئامێدی | 25 / 8/ 1988 |
| (13) ئێکماڵە / بەرێ گارە/ ئامێدی | 25 / 8/1988 |
| (14) گیزێ / بەرێ گارە / ئامێدی | 25 / 8/ 1988 |

(15) بەلیتێ / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(16) باوەرکا کەڤری / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(17) گرکا / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8 / 1988
(18) گوڤلینک / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 1988/8
(19) ڕیدینیا / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(20) سارکس / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(21) زێوکا / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(22) شیرانە / بەرێ گارە / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(23) سوارێ / بەرواری ژێری / ئامێدی 25/ 8/ 1988
(24) سپیندارێ / بەرواری ژێری / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(25) کانیا باسکا / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(26) ناڤوکی / ئامێدی 25/ 8/ 1988
(27) بێمنا نش / ئامێدی 25 / 8/ 1988
(28) برێسە / ئاکرێ 25 / 8/ 1988
(29) جەزگیرا / ئاکرێ 25 / 8/ 1988
(30) جەم جالی / ئاکرێ 25 / 8/ 1988
(31) جەم شرتی / ئاکرێ 25 / 8 / 1988
(32) جەم ڕەبەتکێ / ئاکرێ 25 / 8/ 1988
(33) مێروکێ / ئاکرێ 25 / 8/ 1988
(34) بلمبا س / ئاکرێ 25 / 8/ 1988
(35) توێکا / زاخۆ 25 / 8/ 1988
(36) بەلیجان / زاخۆ 25 / 8/ 1988
(37) زرهەوا / زاخۆ 25 / 8/ 1988
(38) بورجین / دهۆک 25 / 8/ 1988
(39) دمکەلاشێن /دهۆک 25 / 8/ 1988
(40) زیناڤا / دهۆک 25 / 8/ 1988

| | |
|---|---|
| (41) دەبانكی / دهۆک | 25/ 8/ 1988 |
| (42) ناوچەی بەرۆژ / بارزان / هەولێر | 25 / 8/ 1988 |
| (43) ناوچەی مزووری باڵا / هەولێر | 25/ 8/ 1988 |
| (44) هیران و نازەنین / شەقلاوە / هەولێر | 25/ 8/ 1988 |
| (45) خەتێ /رەواندوز | 25/ 8/ 1988 |
| (46) وەرتێ/ رواندوز | 25/ 8/ 1988 |
| (47) ناوچەی ڕۆشین / مزووری / هەولێر | 27/ 8/ 1988 |
| (48) سەرێ ئامێدی / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (49) سێیر / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (50) سێنا / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (51) نێروە / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (52) خەرکول / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (53) کۆجەرەزگاخراب/ئامێدی | 1988/8/26 |
| (54) زێوە/ ئامێدی | 1988/8/26 |
| (55) بەجی / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (56) کانی/ ئامێدی | 1988/8/26 |
| (57) دەرکەنی / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (58) سێری / ئامێدی | 1988/8/26 |
| (59) سکێری/ ئامێدی | 26/ 1988/8 |
| (60) سەرکەل /ئامێدی | 1988/8/26 |
| (61) میرستەک/ئامێدی | 1988/8/26 |
| (62) دەوروبەری ئامێدی | 1988/8/26 |
| (63) چیا ڕەشک /ئامێدی | 1988/8/26 |
| (64) شیفتی /نێروە و ڕێکان | 1988/8/28 |
| (65) هێتوت / نێروە و ڕێکان | 1988/8/28 |
| (66) کانیا بنیک / نێروە و ڕێکان | 1988/8/28 |

(67) باشی / نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(68) سەرنێ / نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(69) ئاره / نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(70) کەرو / نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(71) باولنکی/ نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(72) زێوه/ نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(73) گەلی کوتکی/ نێروه و ڕێکان 1988/8/28
(74) بازی / بەرواری بالا 1988/8/29
(75) بانکا/ بەرواری بالا 1988/8/29

## بڕیارەکانی مەجلسی قیادەی سەورە و دامودەزگاکانی تر

چەند بڕیارێکی سەرانی ڕژێم و دامودەزگا ئەمنییەکانی، کە بە مەبەستی ئیبادەکردنی کورد دەرچوون و جێبەجێ کراون و لەژێر پەردەی ئەستووری ئەو بڕیارانەشەوە، قەتڵ و عامی زۆر دژوارتر و بەرفرەتر لەوەی کە ناوەڕۆکی بڕیارەکان داویەتی، ئەنجامدراوە.. هەر بۆ نموونە بڕیاری ژمارە (1203) کە لە 1983/11/15 دەرچوە؛ هەر لە دیوە دەرەوە و ئاشکراکەیدا زوڵم و ستەمی زۆری تێدایە، تەنها (فیرار و موتەخەلیفي) گرتۆتەوە، بەڵام دیوی ئەو دیوی بڕیارەکە شتێکی دیکە دەڵێ و لە ژێر پەردەی ئەو بڕیارە، بە سەدان و هەزاران لاوی کورد کەوتنە بەر دەسڕێژی گوللە و پەتی قەنارە. زۆربەی ئەو بڕیارانە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە ناوەڕۆکی باسەکەوە هەیە.

# بڕیار

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە دانیشتنێکدا لە ڕۆژی 1987/3/29 بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا:

یەکەم: ڕەفیق (عەلی حەسەن ئەلمەجید)، ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، نوێنەرایەتی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حیزب و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەکا بۆ جێبەجێبەکردنی سیاسەتەکەیان لە تەواوی ناوچەی باکووردا کە ناوچەی کوردستان بۆ ئۆتۆنۆمیش دەگرێتەوە، بەمەبەستی پاراستنی ئاسایش و نیزام دەستەبەرکردنی ئارامی تێیداو پیادەکردنی یاسای ئۆتۆنۆمی لە ناوچەکەدا .

دووەم: ڕەفیق ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی، بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی ئەو بڕیارە دەسەلاتی بڕیاردانی مولزەمی هەیە بۆ هەموو دامودەزگا مەدەنی و سەربازیی و ئەمنییەکانی دەوڵەت، بەتایبەتی ئەو دەسەلاتانەی کە بە ئەنجوومەنی ئەمنی قەومی و لێژنەی کاروبارەکانی باکوور سپێردراوە .

سێیەم: ئەو لایەنانەی خوارەوە لە تەواوی ناوچەی باکوور، بە ڕەفیق ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی دەبەسترێنەوە و ئیلتیزام بەو بڕیار و ڕێنماییانە دەکەن کە لێیەوە دەردەچن، کە بەپێی ئەو بڕیارە پێویستە جێ

به جێ بکرێن:

(1) ئەنجومەنــی ڕاپەڕاندنــی ناوچەی کوردســتان – ئۆتۆنۆمی .

(2) پارێــزگاری پارێــزگاکان و ســەرۆکی یەکــە ئیدارییەکانی سەر بە وەزارەتی حوکمی ناوخۆ یی .

(3) دامودەزگاکانــی موخابــەرات و هێزەکانــی ئەمنی نێوخۆ و ئیستخباراتی سەربازیی.

چــوارەم: ســەرکردایەتییە ســەربازییەکانی ناوچەکە ئیلتــزام بــە فەرمانــی ڕەفیــق ئەندامــی ســەرکردایەتی هەرێمایەتییەوە دەکەن لە هەر شتێکی کە دەیڵێت ( یەکەم، لەم بڕیارە).

پێنجەم: ئــەم بڕیارە لەبــەرواری دەرچوونییەوە کاری پێدەکرێــت، و تا پــێ ڕاگەیاندنێکی دیکــەو کارکردن بەو حوکمە یاســاییانەی کــە لەگەڵ حوکمەکانی ئــەم بڕیارە ناکۆکن، دەوەستێ.

**سەدام حسێن**

**سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش**

**بەڕێوبەرایەتی ئەمنی گشتی**
**بەروار :** 1987/5/11
**بابەت :ڕووخاندنی خانوو**

ئەمــڕۆ حیجــزی کەلوپەل و ڕووخاندنــی خانووی ئەو تاوانبارانەی کەناویان دێت، کرا:

(أ) خانووی تاوانبار هۆشیار گۆروون ئەحمەد لە رزگاری نزیک مالی بەرێز پارێزگارو کەلوپەلی ماڵەکە بۆ گەراجی ئیدارەی ناوخۆیی، گوێزرایەوە.

(ب) خانووی تاوانبار (بەهائەددین مەعروف محیەددین)، لــە دارۆغــا و کەلوپەلــی خانووەکە بۆگەراجــی ئیدارەی ناوخۆیی، گوێزرایەوە .

(ج) خانــووی تاوانبار( ئەبوبەکر مەحمــود) لە ئیبراهیم پاشا کەل و پەلی خانووەکە بۆ گەراجی ئیدارەی ناوخۆیی، گوێزرایەوە .

(د) خانووی تاوانبار( جەبار محەمەد قادر) لەمەڵکەندی، کەلوپەلــی خانووەکــەی بــۆ گەراجی ئیــدارەی ناوخۆیی گوازرایەوە.

(ه) کەلوپەلــی خانــووی تاوانبار (جەزا محەمەد ســالح فــەرەج)، خانووەکە موڵکــی دەوڵەتە و بۆکارگەی جگەرە دەگەڕێتەوە.

کـەل و پەلێکیشـمان لەماڵـی تاوانبـار تەهـا حاجـی حەسـەن نەبی، بەوەی کەخانەوادەکەی لە 1987/4/4دا تەسـفیرکراون و خانووەکە لەلایەن پۆلیسێکی هاتوچۆوە بەکرێ گیرابوو، لەلایەن خاوەنی خانوو ناوبراو بە باقر.

**بفەرموون بۆ ئاگاداریتان لەگەڵ رێزدا**

**رائیدی ئەمن**

**سەرۆکایەتی کۆمار**
**سکرتێر**
**بەڕێوبەرایەتی ئەمنی گشتی**
بۆ/ ئەمنی هەولێر /ش1
ژمارە : 3360
بابەت/زانیاری
بەروار:1988/6/3

بەپێی بروسکەی ژمارە 1345 لە 1988/6/2 ئەفسەری ئەمنی کۆیە ئەمەی خوارەوەی پێراگەیاندین:

تاوانبار عائیشــە لەلایەن ئەمنی هەولێرەوە دەسگیرکرا کــە دەکا دایکی تاوانبار محەمەد حەلاق، ئامیر مەفرەزەی حیزبی شــیوعی بەکرێ گیراو لە کەرتی کۆیەدا، زانیاری بەردەست لەلامان، لەسەری، ڕۆڵێکی بەرچاوی لە چالاکی حیزبی بەکرێ گیراودا هەیە لەناوچەکەداو بە بەردەوامی دێتــە ناوچــەی ســماقولی و ئەڵقــەی پێک بەســتنەوەیە لەنێــوان زومرەی تێکــدان و ڕەگەزی هــاوکار لەگەڵیاندا لەنێو خۆ ولەنێــوان ئەو پارێزگایانــەی کەدێت: (هەولێر، ســلێمانی، بەغــدا) دێــت و دەچێــت، پــارە کۆدەکاتــەوە بەتایبەتی لەرفێنراوەکان بــەوەی کە برێکی دیاریکراو لە کەســوکاریان وەردەگرێــت لەبەرامبــەر بەڕەلاکردنیاندا؛ بۆزانیاریتان تکایە لەگەڵ ڕێزدا .

**نەقیبی ئەمن**
**بەڕێوبەری ئەمنی قەزا**

**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی گشتی**
**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر**
**ژمارە: ش1 /پ/1988/8/1**

بۆ/نووسینگەی ڕێکخستنی باکوور –سکرتاریەت
بابەت /جێبەجێکردنی حوکمی گەل

بروسکەتان خێراو نهێنی 2057 لە 1988/8/16، ئاگاداری ڕەفیق جەبار کرایەوە کە ئەم بەڕێوەبەرێتییە تاوانکار عائیشە قادر یونس، نازناو بە عائیشە گوڵی دایکی شیوعی (محمد حلاق)ی دەستگیر کرد کەکچەکەی قوتابی (ئیمان)ی ڕفاندبوو و شەوێک لەلای دایکی تاوانباری ئەوەی سەرەوە، مابووەوە، مەسەلەی بەشداریکردن لە جێبەجێکردن (جێبەجێکردنی حوکمی گەل) مان بۆ خستەروو و ئامادەیی خۆی بۆهاتن بۆشوێنی جێ بەجێ کردن نیشاندا، و لەبەر ئەو زروفە ئەمنییە تایبەتییەی کەپێش بەرواری 1988/8/8هەبوو و وەک ئاگادارییەک لەهەستانی شیوعییەکان و ئەوانی تر لە زومرەی تێکدان بە چەواشەکردن و بەوەی کە لە سێدارەدانکردنی ناوبراو بابەتێکی چەورە بۆ چەواشە، لەسەر ئەم بناغەیە حوکمی گەلی بەسەردا جێبەجێکرا بەنهێنی، بفەرموون بۆ ئاگاداریتان لەگەڵ ڕێزدا .

**عەمیدی ئەمن**
**بەڕێوەبەری ئەمنی پارێزگای هەولێر**

**سەرۆکایەتی کۆمار**
**سکرتێر**
**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی گشتی**
**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر**

ژمارە / ش. س/15101
بەروار : 22/10/ 1989
نهێنی و شەخسیی
بۆ/نەخۆشخانەی هەولێری فێرکردن
بابەت /ناردنی تەرمی تێکدەران (مخربین)

تەرمی دوو تێکدەر، کە ناوەکانیان لەخوارەوەدا هاتووە، بۆتان دەنێرین، تکایە وەریان بگرن و شەهادەی مردنیان بۆڕێـک بخـەن و ئـاگاداری بەڕێوەبەرایەتی شـارەوانی هەولێر بکەن بۆمەبەستی ناشتنیان و ئاگادارکردنەوەمان، تکایە ......

**عەقیدی ئەمن**
**بەڕێوەبەری ئەمنی پارێزگای هەولێر**

**ناوەکان**
(1) **قانع ابراهیم احمد محی الدین.**
(2) **علی اسماعیل پیرداود.**

## بڕیار

ژمارەی بڕیار :114
بەروار : 1990/2/28

بەپێـی حوکمەکانی بڕگـە(ء) لەبەندی چـل و دووەمین لەدەسـتوور، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا:

یەکـەم : دەسـت بەسـەرداگرتنی ئـەو خانووانـەی کە لەخوارەوە ژمارە و خاوەندارێتییان دیاریکراوە و بەناوی وەزارەتی داراییەوە تۆمار بکرێت .

| زنجیرە | ناو | شوێنی خانووەکە |
|---|---|---|
| 1 - | علی حیدر عزیز | لەکەرتی 4 پارێزگای هەولێر |
| 2 - | احمد عزیز رسول | لەکەرتی 4 پارێزگای هەولێر |
| 3 - | هاشم سەید سەعید | 182/ م کەرتی 3 پارێزگای هەولێر |
| 4 - | فتاح قادر | 135/م کەرتی 5 پارێزگای هەولێر |
| 5 - | سلیمان عبدالله الیاس | 24 کەرتی 5 پارێزگای هەولێر |

دووەم: وەزیرە پسـپۆڕەکان و لایەنە پەیوەندیدارەکان حوکمەکانی ئەم بڕیارە جێ بەجێ دەکەن.

**سەدام حسێن**
**سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش**

**کۆماری عێراق**
**وەزارەتی ناوخۆ نهێنی و تایبەتی و خێرا**
ژمارە/ش3/ 66
بەروار 1985/8
**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی عامە**
بەڕێوەبەراتی ئەمنی (الجانب الصغیر )ی سیاسی
بۆ: بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی تەئمیم - ش-3
بابەت/ زیادکردنی هیجرەتی کوردەکان بۆ شاری کەرکوک.
ئەو موخابەرانەی کەدوامینی؛ کیتابتان 3679 لە 1985/7/30 و بروسکەی تەئکیدکردنەوەتان 3886 لە 1985/8/10 بوو.
(1) ا- سەبارەت بەبڕگەی (1) لەکتابتان 2382لە 1985/5/9 حاڵەتی یەکخستن لەگەڵ سەرکردایەتی فیرقە حزبییەکان و ڕێکخراوەکان لەو لایەنەدا بەئاکام گەیشتووە و تائێستاش هەر لە بەدواداچوون داین و لەوەی لەپاشدا لەلامان ئیسپات دەبێ لەناوەکان، ئاگادارتان دەکەینەوە.
ب- هەبوونی چەند خێزانێک کە لەناوچەکەدا نیشتەجێ بوون لەوانەی کەیەکێکیان پەیوەندیان بەلایەنی 'مخرب'ەکانەوە کردبوو وگەڕایەوە ریزی نیشتیمانی و ئەوان لەبنەڕەتدا نیشتەجێی پارێزگان و لەگەڵ ئەوەدا، لیستێک بەناوەکانیان

دەنێرین بۆئەوەی ئاگادارمان بکەنەوە کە ئاخۆ بڕیارەکە دەیانگرێتەوە یان نەء، بۆ کردنی ئەوەی کەپێویستە بیکەین.
(2) برگەی (2) لەکتابی سەرەوەتان، ئاگاداری ئەنجوومەنەکانی گەل و موختارەکان کرایەوە بۆ ئەوەی لەم ڕووەوە ئەوەی پێویستە بیکەن .
(3) گشت موختارەکان ئاگادار کرانەوە کە (ئاگاداری خەڵکەکە بکەنەوە کە خانوو، یان ژوور لە خانووەکانیان بەهیچ کەسێک بەکرێ نەدەن ئەگەر ڕەزامەندی نیشتەجێ بوون لەپارێزگا)ی لەلایەنە تایبەتمەندەکانەوە لەلانەبێت و تائێستاش هەر لە بەدواداچوونی ئەو بڕگەیەداین.
(4) ئەوەی پێویستە کرا سەبارەت بەنووسینگەی دەڵاڵەکان و بەڵێنی دەسخەتییان لێوەرگیراوە کەهیچ مامەڵەیەکی کڕین و فرۆشتن نەکەن بە ڕەزامەندی لایەنەکانی ئەمنی نەبێت .
(5) دە خێزان کە لە نێو پارێزگادا نیشتەجێ بوون و یەک لە ئەندامەکانیان لەگەڵ زومرەی تەخریب دابوون، ڕاگوێزران، ولیستێک نێردرا ناوی ئەو خێزانانە و ژمارەی ئەندامەکانی تێدایە ..............
(ئەوەی تر کەمابووەوە، چەند وشەیەکی بەراییان دیار نەبوو ورەش کرابووەوە بۆیە نەمانتوانی بیکەینە کوردی).
**بەڕێوەبەری ئەمنی**
**الجانب الصغير**

بسم الله الرحمن الرحيم

مجلس
قيادة الثورة

رقم القرار / ١٢٠٢
تاريخ القرار / ١٩٨٣/١١/٥

## قــــرار

استنادا الى احكام الفقرة (أ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت
قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١٩٨٣/١١/٥ ما يلي :ـ

أولاً ـ يعدل نص الفقرة (١) من قرار مجلس قيادة الثورة المرقم (٨٨٦) في ١٩٨١/٧/٢١ ويقرأ على الوجه الآتي :ـ

١ ـ تمنع المحاكم ودوائر الشرطة من سماع اية دعوى ضد افراد القوات المكلفة بتعقيب الهاربين والمتخلفين عن اداء الخدمة العسكرية في حالة اضطرار هؤلاء الافراد الى استعمال القوة بهدف القاء القبض على الهاربين والمتخلفين اذا ترتب على ذلك وقوع اضرار مادية أو اصابات بدنية ولو نتج عنها موت المصاب .

ثانياً ـ تلغى جميع القضايا القائمة ضد عناصر القوات المشمولة باحكام هذا القرار وتوقف الاجراءات القانونية المتخذة بحقهم بصورة نهائية .

ثالثاً ـ يتولى الوزراء المختصون تنفيذ هذا القرار .

صدام حسين
رئيس مجلس قيادة الثورة

**ژمارەی بڕیار :1203**
**مێژووی بڕیار :1983/11/5**

**بڕیار**

بەپێی ئەحکامــی بڕگەی (أ) لەبەندی چل و دووەمین لە دەســتووری کاتی مەجلیسی قیادەی سەورە لە دانیشتنی ڕۆژی 1983/11/15 بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا:

یەکــەم : دەقی بڕگەی (1) لەبڕیاری مەجلیســی قیادەی سەورە ژمارە 986 لە 21/ 7/ 1981 دەسکاری دەکرێ و بەم شێوەی خوارەوە دەخوێنرێتەوە :

(1) دادگاکان و دەزگاکانــی پۆلیــس لە گوێگرتن لەهەر دەعوایــەک قەدەغەدەکرێــن، لــەدژی ئــەو مەفرەزانــەی کــە تاقیب کردنی هەلاتــوو و دواکەوتــووەکان لە بەجێ گەیاندنی خزمەتی ســەربازیان پێســپێردراوە لە حاڵەتی ناچاربوونــی ئــەو مەفرەزانــە بــۆ بەکارهێنانــی هێز بە ئامانجــی دەســگیرکردنی هەلاتــوو و دواکەوتــووەکان، ئەگــەر لەئەنجامــی ئــەوەدا زەرەر و زیانــی ماددییــان پێکرانی جەســتەیی کەوتــەوە؛ ئەگەرببێتە هــۆی مردنی لێدراوەکەش.

دووەم: هەمــوو ئەو دەعوایانەی کە لە دژی عەناســری ئــەو مەفرەزانەی کەئەحکامی ئەو بڕیــارە دەیانگرێتەوە؛ تۆمارکراون دادەخرێن و بەیەکجارەکی ئیجرائاتی یاسایی

لەسەریان دەوەستێ.

سێیەم : وەزیرە پەیوەندیدارەکان، جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە بە ئەستووە دەگرن.

**سەدام حسێن**

**سەرۆکی مەجلیسی قیادەی سەورە**

بسم الله الرحمن الرحيم

**مجلس قيادة الثورة**

رقم القرار / ٦٦٦

تاريخ القرار / ١٩٨٠/٥/٧

**قـــرار**

استناداً الى أحكام الفقرة (آ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور المؤقت قرر مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١٩٨٠/٥/٧ ما يلي : ـ

١ ـ تسقط الجنسية العراقية عن كل عراقي من أصل اجنبي اذا تبين عدم ولائه للوطن والشعب والاهداف القومية والاجتماعية العليا للثورة .

٢ ـ على وزير الداخلية ان يأمر بإبعاد كل من اسقطت عنه الجنسية العراقية بموجب الفقرة (١) ما لم يقتنع بناء على اسباب كافية بأن بقاءه في العراق أمر تستدعيه ضرورة قضائية او قانونية او حفظ حقوق الغير الموثقة رسمياً .

٣ ـ يتولى وزير الداخلية تنفيذ هذا القرار .

صدام حسين

رئيس مجلس قيادة الثورة

**ژمارەی بڕیار:666**
**مێژووی بڕیار : 1980/5/7**

**بڕیار**

بەپێی حوکمەکانی بڕگەی (ء) لەبەندی چل و دووهەمین لە دەستووری کاتی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە دانیشتنی ڕۆژی 1980/5/7 دا ئەمەی خوارەوەی بڕیاردا :

(1) هەر عێراقییەکی بەبنیات بێگانە ئەگەر نادڵسۆزی بۆ گەل و نیشتیمان و ئامانجە باڵایە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکانی شۆڕش دەربکەوێت، ڕەگەزنامە عێراقییەکەی دەکەوێت .

(2) پێویستە وەزیری ناوخۆ فرمان بدا بە دوورخستنەوەی هەموو ئەوانەی بەپێی بڕگەی (1) ڕەگەزنامەی عێراقی لێ داماڵراوە، ئەگەر بەپێی چەند هۆیەکی تێرایی قەناعەتی نەهاتبێ کە مانەوەی لە عێراقدا کارێکە و زەرورەتی دادوەری یان یاسایی یاخود پاراستنی مافە بەڵگەدارەکانی کەسانی تر پێویستی دەکات.

(3) وەزیری ناوخۆ ئەم بڕیارە جێ بەجێ دەکات.

**سەدام حسێن**

**سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش**

**ژمارەی بڕیار: 150**
**مێژووی بڕیار: 1980/1/28**

**بڕیار**

بەپێــی حوکمــی بڕگــەی (ء) لەبەندی چــل و دووەمین لەدەســتووری کاتی ئەنجومەنی ســەرکردایەتی شۆڕش، لــە دانیشــتنێکی ڕۆژی 28/ 1/ 1980دا بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا :

(1) هەر ئافرەتێکی عێراقی شــوو بە بیانییەک دەکات، لە خزمەتکردنی لە ئۆفیسە ڕەسمی و نیمچە ڕەسمییەکان و دامەزراوەکانی کەرتی ئیشتراکی، بێ بەش دەکرێت.
(2) لە 19/ 1/ 1980ەوە کار بەم بڕیارە دەکرێت .
(3) ئەم بڕیارە لە ڕۆژنامەی رەسمی بڵاو دەبێتەوە، و وەزیرەکان حوکمەکانی جێ بە جێ دەکەن.

**سەدام حسێن**
**سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش**

**ژمارەی بڕیار : 700**
**بەروار : 1988/8/27**

بەپێی ئەحکامی بڕگەی (ء) لەبەندی (42)، لەدەســتوور، مەجلیسی قیادەی سەورە، لە دانیشتنی ڕۆژی 1988/8/27 یدا، بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا:

(1) - حوکمـــی لــه ســـێدارەدان لەلایـــەن ڕێکخـــراوی (مونەزەمـــە)ی حیزبییەوە، پاش دڵنیابـــوون لە ڕووداوی تاوانی هەڵاتن یا دواکەوتن لە خزمەتی سەربازی، بەهەر هەڵاتوویەک یا دواکەوتوویەک کە دەســـگیر دەکرێ یا لە پاش 1988/8/8 بە چاوپۆشـــین لە چەند جار هەڵاتنەکە و ماوەکەی؛ جێ بەجێ دەکرێت.

ب- هەڵاتـــوو یـــان دواکەوتـــوو کە بـــە "پەشـــیمانی" لە هەڵاتنـــدا یان لەپاش 8/8/ 1988 دا گەڕاوەتەوە بۆ یەکە عەســـکەرییەکەی، هەوڵدەدات بـــۆ جێبەجێکردنی پێڕەوو یاساکانی عەسکەری لەسەری .

(2) ئەحکامی بڕیاری مەجلســـی قیادەی ســـەورە ژمارە (10) لـــە 3/ 1/ 1988 (ســـێی کانوونی دووەمی هەزارو نۆســـەدو هەشـــتاو هەشـــت ) بەســـەر ئـــە و هەڵاتـــوو و دواکەوتوانـــەدا پیـــادە دەکرێـــت کە بە پەشـــیمانی خۆیان تەسلیم کردۆتەوە یان هەتا 7/8/ 1988 دەسگیرکراون.

(3) - ء- حوکمـــی لە ســـێدارەدان لەلایـــەن ڕێکخراوی حیزبییەوە بەسەر هەر ئەندامێکی قیادەی فیرقە لە حیزبی بەعســـی عەرەبی ئیشـــتراکی بەرەو خـــوارەوە و بە هەر بەرپرســـێکی ئەمنی یان لە پۆلیسدا جێ بەجێ دەکرێ کە لەسەری ئیسپات بێ بەوەی ئاگاداری هەبوونی هەڵاتوو و دواکەوتوو بووە لەخزمەتی ســـەربازی لەو ناوچەیەی کەلێی بەرپرس بووە و هیچ ئیجرائێکی لە دژیاندا نەکردووە

یا ئاگاداری سولّوتاتی نەکردۆتەوە لێیان .

ب- بابەتی بەرپرس لە ئاستی ئەندامی قیادەی شوعبە بەسەرەوە کەلەسەری ئیسپات دەبێت کە ئاگاداری هەبوونی هەڵاتوو و دواکەوتووان بووە لە خزمەتی عەسکەری و ئیجرائاتی لەسەر وەرنەگرتوون یا ئاگاداری دەسەڵاتە پسپۆڕەکانی نەکردۆتەوە لێیان، دەخرێتە پێش رەفیق ئەمین سری هەرێم، سەرۆکی کۆمار بۆ ئەوەی بە شیاوی دەبینێ دەربارەی، بڕیاری لێبدات .

(4) کار بەو بڕیارە دەکرێ لە مێژووی دەرچوونییەوە و لایەنە پەیوەندیدارەکان جێبەجێی دەکەن.

**سەدام حسێن**

**سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش**

**بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی**
**ژمارە** /1002
**بەروار** / 15/ 1988/1
بۆنەخۆشخانەی سلێمانیی سەربازی
بابەت / ڕێکخستنی شەهادەی مردن

ئەوتاوانبارانــەی خوارەوەتــان بــۆ دەنێرین کەلەســەر فەرمانــی دەســەلاتی بالاوە لە ســێدارەدان کراون، لەبەر ئــەوەی لەگونــدە (مەحزووورە امنیــا)ەکان بــوون، تکایە شــەهادەی مردنیان بۆ ڕێک بخەن و ئاگادارمان بکەنەوە لەگەڵ ڕێزدا .

**عەقیدی ئەمن**
**بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی**

**ناوەکان**

1 - مەحمود ئەحمەد عەزیز فەقێ محەمەد سۆرانی
2 - حەمە تاهیر حەسەن عەبدولڕەحمان سۆرانی
3 - عەبدوڵلا سالح ڕەشید گۆرانی
4 - جەمال ئیبراهیم حسێن قادر گۆرانی
5 - محەمەد نەجم عەزیز مەحمود زەندی
6 - کاروان حسێن عەبدولڕەحمان حەسەن سۆرانی
7 - ئەبوبەکر عوسمان سەعید فەتحوڵلا سۆرانی
8 - محەمەد فەرەج فەتاح مەحمود سۆرانی
9 - مستەفا حەمە شەریف شاسوار گۆرانی

نموونەی شـێوازەکانی کوشـتن و ئازار و ئەشـکەنجەدان وەک هۆیەکی جینۆسـاید و ئیبادەکـردن کە رژێمی بەعس لە هەموو شـوێن و سـوچێکدا، لە زیندان و مەرگخانەکانیدا دەرهەق بە گەلانی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بە تـایبەتی ئەنجامیدەدا، ئـەوەی دەتوانـرێ تـەعبیـری لێ بکـرێ ئەم چەنـد ئاماژەی خوارەوەیە:

(1) بەکارهێنانــی چەکــی کۆکــوژی کیمیایــی کــە وەحشیگەرانە لە دژی هەموواندا بە تایبەتی ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە بەکارهات. یەکەمین لێدان لە 1987/4/16 لە دۆڵی بالیســان وشــێخ وەســانان بوو کە بە ســەدان شەهید و برینداری لێکەوتەوە و لە دواییدا بریندارەکانیش زیندە بە چاڵ کران، لە پاشدا لە 1987/5/27 لە ناوچەی رەوانــدز گوندی مەلەکان و دەوروبــەری بەکار هات کە زۆربەی زۆری ئیبادە بوون و لە 1988/3/16 کارەساتی گەورەی هەڵەبجە بە هۆی ئەم چەکەوە نرایەوە و لە ئابی 1988 دا بــە هەزاران بێ گوناه لــە گەلی بازێ (دهۆک) ئیبــادە بوون ....هتد، ئەو گازانەی کــە رژێم بەکاریهێنان: خەردەل و ســیانید و گازەکانی دەمارە مێشــک (سارین، تاپۆن..) بوون. لە شــەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهانیدا هیچ دیکتاتۆرێک چەکــی کۆکوژی لەو بابەتانەی لە دژی گەلانــی خۆیان بەکاریان نەهێنــاوە، وا یەکەمین جارە کە سەدام حسێن و دار و دەستەکەی وەک پێشینەیەک چەکی کۆکوژی لە دژی هاووڵاتیانی خۆی بەکار بهێنێ..

(2) کوشتنی بە کۆمەڵ و زیندە بە چاڵکردنی بە کۆمەڵ : لەوەشــدا ئــەو چەنــدان گۆڕی بــە کۆمەڵ کــە هەموو پارێزگاکانی کوردســتانی گرتۆتەوە باشــترین بەڵگەن و

ڕێکخراوەکانی داکۆکیکار لە مافی مرۆڤ (ئەمنستی ئینتەر ناشنال، میدڵ ئیست وۆچ...) یش بە بەڵگەوە شاهێدی ئەو حەقیقەتەن.

(3) ژەهراویکردنــی نان: لە کاتــی ئەنفالکردنی ناوچەی بەهدینانــدا (1988-1989) کۆچڕەوێکی زێتر لە سەد هەزار کەسی بەرەو سنوورەکانی تورکیا و ئێران دەستپێکردو ڕژێــم لــەو دیــوی سنووریشــەوە هــەر وازی لێهێنان و ئەوانەی مابوونەوە هێرشــی ئەنفــال و کیمیایی ئێبادەی نەکردبوون و نەیکوشــتبوون، لە ئــۆردوگا زیندانییەکانی تورکیادا ڕژێــم توانی لە ڕێگای بەکرێگیراوەکانیەوە ئارد و هەویــری نــان ژەهــراوی بکات و ببێتە هــۆی مردن و پەککەوتــن و ســەقەت و ئیفلیجبوونــی نزیکەی (2000) هەزار کــەس، لەوانەیە ئەم کارە نامەردانەیە بە ئاگاداری یاخود هاوکاری دەوڵەتی تورکیاشەوە بووبێت چونکە نە هێشتوویەتی پێکراوەکان چارەسەر بکرێن و نە بواریشی داوە کــە هۆیەکانــی ڕاگەیاندنــی دەوڵەتــان و ڕێکخراوە داکۆکیکارەکانــی مافــي مرۆڤ لێکۆڵینەوەی پێویســت لە سەر ئەو کارەساتە بکەن.

(4) بەکارهێنانــی ژەهری "ثالیۆم" لە ڕێگای تێکەڵکردنی لە گەڵ ئاوو ماست و شەربەت و کەباب و شتی تردا: ئەم ژەهرە کە دەبێتە هۆی مردنی لەســەرەخۆ (3-16 ڕۆژ)، لــە بنەڕەتدا بۆ قڕکردنی جرو جانەوەری وەک مشــک و

جورج بەکار دێت و بۆ مرۆڤ کار دەکاتە سەر هەردوو کۆئەندامی هەرس و مێشک و دەبێتە هۆی ئیفلیج بوون و تەنگە نەفەسی و قژ کەوتن.. نموونەی ئەوانەش (سالح فارس 1981) (تاهیر عەزیز خانەقینی لە زیندان) (عەلی مەندەلاوی) (بێستون مەلا عومەر 1987) (سریعە مەلا موحەرەم 1987) (د.کامەران 1986) (جۆقی یەزیدی 1985) (شەوکەت ئاکرەیی).

(5) بەکارهێنانی ژەهری زەرنیخ و نیتراتی زێڕ: هەر لەزەمانی (قصر النهایە) رژێم ئەم شێوازەی وەک هۆکارێکی ئیبادە گرتوتە بەر (حسێن شێروانی) یەکێک بوو لەو قوربانییانەی لە 1972 دا لە (قصر النهایە) بە هۆی کاریگەری زەرنیخەوە گیانی لە دەستدا. ئەوەی زیاتریش یاریدەی بەکارهێنانی ئەم ژەهرە دەدات ئەوەیە کە بێتام و بێبۆنەو رەنگە زەردەکەی لە کاتی تێکەڵکردنی لە گەڵ خواردەمەنیدا یارمەتی بزربوونی دەدات و نیشانەکانی زوو دەرناکەوێت و زیاتر لە حاڵەتێکی نەخۆشی وەک هەوکردنی گەدە و رێخۆڵەکان دەچێت نەک دەرمانخواردکردن.

(6) بەکارهێنانی ژەهری جۆراوجۆر لە رێگای چارەسەرکردنی نەخۆشییەوە: رژێم لە رێگای بنکە تەندروستییەکانی دێیەکان و پیاوانی خۆیەوە خەڵکی نەخۆش کە بۆ چارەسەر روویان لەو بنکانە دەکرد، لە

جیاتــی دەرمــان، ژەهریان بۆ لەشووشــە دەکردن (خدر حســێن - کرێکار) و (علی ابراهیم- قوتابی) هەردووکیان لــە 1981 و 1982 لــە ناوچەی وەرتــێ (هەولێر) وەک نموونــەی ســەدان قوربانــی دیکە لە ئاکامی ئــەو کارەدا گیانیان لە دەستداوە.
(7) بەکارهێنانی ســیانیدی پۆتاســیۆم: کە لە قڕکردندا کاریگەر و خێرایە.
(8) کوشــتنی هاوولاتییــەک و تاوانبارکردنــی خەڵکــی گوند بە هۆیەوە: لە دوای ساڵی 1975 و لە چوارچێوەی بەرنامــەی ئیبادەکردنــی کــورددا ڕژێم لە گونــدەکان بە تایبەتــی کەســێکی گومانی لێبکردایە، یا ئەگەر لێشــی بە شــک نەبوایە، دەیکوشــت و تەرمەکەی فڕێ دەدایە دەم ڕووبارێک یا کۆلانێک یاخود نێو ئەشکەوت و باخچەیەک، پاشــان هــەر خــۆی ئاشــکرای دەکــرد و هــەم ئیرهابی خەڵکەکــەی پێدەکــرد و هەم کۆمەڵــە خەڵکانێکی تاوانبار دەکــردن، بێ لێکۆڵینەوە و دادگایی لــە زیندانەکانی توند دەکردن یا لە ســێدارەی دەدان تا ڕاگواســتنی گوندەکان ناوەناوە ئەو حاڵەتەی بە بەردەوامی ئەنجامدەدا.
(9) مەیینی خوێن: ڕژێم ئەوەی لە زیندانەکاندا دەکرد و لە ڕێگای دەرزییەوە مادەی (شــیر) لە لەشی گرتووەکان دەکرد، کــە دیارە ئەمەش دەبێتە هــۆی مەیینی خوێن لە لەشدا و ئاکام مردنی ئەو کەسە.

(10) ناچارکردنی گیراو و بەندکراوەکان بە خواردنەوەی گاز و بەنزیـن و نـەوت: کە دیارە ئەمانـەش وەک چەند ماددەیەکـی کیمیایی دەبنە هـۆی ژەهراویکردنی لەش و بـەدەم ئازارەوە مردن. پێ خواردنەوەی ئەو مەوادانە بە ڕێژەیەکـی زۆر دەبێتە هۆی شـین هەڵگەرانی پێسـت و سەریەشە و سووتانەوەی نێو دەم و گەدە و ڕیخۆڵەکان و تێکچوونـی لێدانـی دڵ و کۆخـە و ڕشـانەوە و ئیفلیج بوونـی مەڵبەندی هەناسـەدان لە لەشـدا و لەنێوچوونی خڕۆکەی سوور و دەرکەوتنی ماددەی ماتهیموگلۆبین لە میزدا و بەدەم ئەشکەنجە و تلانەوە مردن .

(11) ناچارکردنـی گرتوو و زیندانی بـە خواردنەوەی میز یا ڕشانەوە.

(12) ناچـارکردنـی زیندانـی و گرتـووەکان بـە خواردنەوەیەکی تا ڕادەی ژەهراوی بوون بە تایبەتی بیرەو لە هەمان کاتدا بەسـتنی (ئەندامی میزاوزێ) بە شێوەیەک کـە نەتوانـێ میز بکات، دیـارە کە ئـەوەش دەبێتە هۆی ژەهراویبوون بەو بۆرییەی کە لە لەشـدا کەڵەکە دەبێت و ئەسـتووربوونی لەش و ئازاری گورچیلە و هەوکردنی بۆرییەکانـی میـز، وەک سـووکایەتی و دروسـتکردنی حاڵەتێکی نەفسـی دژوار، زانا و پیاوانی ئایینیش لەوانەی زیندانی کرابوون ناچار کراون کە خواردنەوە بخۆنەوە.

(13) ئاخنینـی دەرزی گـەورە لـە زمانـی زیندانـی و

دەربەدەرکردنی و بەستنەوەی دەست و پێی بۆ ئەوەی نەتوانێ دەرزییەکان بهێنێتە دەرەوە.
(14) کولاندنی زیندانی: بە زیندوویەتی بە خستنە ناو مەنجەڵی گەورەی ئاوی داغ و کوڵیوەوە تا گیانی لە دەستدەدات، یان پڕکردنی زیندانی لە ئاوی کوڵیو یا شلەمەنی تر کە دەبێتە هۆی تێکدانی گەدە و ڕیخۆڵەکان و .. هتد.
(15) ئەشکەنجەدانی زیندانی بە تینووکردنی بۆ ماوەیەکی درێژ.
(16) هاوێژتنی زیندانی لە بەرمیلی قیری تواوە.
(17) بەکارهێنانی حەوزی ئەسید و تیزاب:(ترشی کبریتیک و نیتریکی چڕ) کە دەبێتە هۆی تواندنەوەی لەش و گۆشت و ئێسقان، زۆر جار خودی دیکتاتور هەر وا بۆ سەیر و سەفایی مومارەسەی ئەو کارەی کردووە و جاری وا هەبووە تەنها بەشێکی زیندانی خراوەتە نێو حەوزەکە وەک هۆکارێکی ئەشکەنجەدان.
(18) چاو دەرهێنان، یەک یان هەردووکیان: ئەمەش بە جۆرەها هۆکار ئەنجامدراوە، یەک لەوانە ئامێرێکە کە هێزێکی موگناتیسی هەیە و لە چەند چرکەیەکدا چاوی پێ دەردەپەڕێنرێت و لە شوێنیدا خوێ و مەوادی کیمیایی دیکەی پێ وەردەکرێت.
(19) بڕینی زمان یان سووتاندنی بە جگەرە یاخود بە

کارەبا یا بە پارچە ئاسنی سوورکراوە.
(20) دەرکێشانی نینۆکی پێ یان دەست یا هەردووکیان و دەرزی ئاژنکردنی نێوان گۆشت و نینۆک.
(21) بەکارهێنانی کەلوپەلی دارتاشی بۆ ئەشکەنجەدانی زیندانی.
(22) پڕکردنـی سـکی زیندانی لە هەوا بـە فوودەرێک (حقنە) لەڕێـگای کۆمەوە، ئەم فوودانە بەردەوام دەبێ تا رادەی لەهۆش خۆ چوون و سک تەقین.
(23) بڕینی بەشێک لە لووتی زیندانی: (ئەشکەنجەدراو) یا سووتانی یاخود شکاندنی بە چەکوشی ئاسن.
(24) بڕین یا کونکردنی گوێ بە بزمار و بەسـتنەوەی بـە دیـوارەوە بە هۆی لە بزماردانی دەسـت و گوێ : بە شـێوەیەک کە کەمترین جوولانەوەی گرتوو دەبێتە هۆی هەڵقاچینی گوێ و ئازارێکی بێ شوماری دەست.
(25) بڕینـی لێو یـا سـووتاندنی: هەروەها شـکاندنی ددانـەکان و شـەویلاگ بـە هـۆی لێدانی وەحشـیانەی بەردەوام لە دەم.
(26) سـووتاندنی شوێنی جۆرا و جۆری لەش بە ئاگر یـا ئوتووی کارەبایی یان بە شیشـی سـوورەوەکراو و جگەرە، لە دەم و چاو و سەر و ئەندامی میزاوزێ.
(27) قژ و مووهەلکێشـان لە پێسـتەی سەر یا ریش و سـمێڵ یان هی برۆوە برژانگ و بـن هەنگڵ و بەرزگ و

مووەکانی دەست و پێ و ئەندامی میزاوزێ: کە زۆر وا ڕێککەوتووە لەگەڵ مووەهەڵکێشانەکەدا پێست و گۆشتیشی لەگەڵ خۆی هێناوە و بۆتە مایەی ئەشکەنجەیێکی لە ڕادەبەدەر.

(28) دانیشاندنی ئەشکەنجەدراو لەسەر کورسییەکدا: دوای بەستنەوەی دەست و پێی و ڕووتکردنەوەی ئینجا دانانی بوتڵی شووشەی سەرشکاو و ناچارکردنی و گوشار و هێزخستنە سەر شانەکانی تا شووشەکە دەچێتە کۆمییەوە و خوێنی لەبەر دەڕوا و ناتوانێ ڕێ بکات.

(29) دەستدرێژکردنی سێکسی بۆ سەر ژنان و پیاوان وەک یەک: بە شێوازێکی وا کە ناگوترێ، زۆر جاریش ئەشکەنجەدراوێک ناچار کراوە کە دەستدرێژی بکاتە سەر ئەشکەنجەدراوێکی تر.

(30) سووکایەتی پێکردن و ئازاردانی دایک و باوکی زیندانییەکە: لە پێش چاویدا بۆ ئەوەی دەروونی بڕووخێنێ و دان بە کارێکدا بنێت کە نەیکردووە، هەروەها ناچارکردنی ئافرەتان بۆ دیتنی ئازارو ئەشکەنجەدانی پیاوان بەو مەبەستەی کاریان لێبکات و ئیعتیرافبکەن.

(31) بەکارهێنانی دەزگای کەبسکردن لە مەعدەنی ئاسن: کە بە هۆیەوە سەری ئەشکەنجەدراو یا پێیەکانی دەخرانە دووتوێیەوە و گوشار پاڵەپەستۆی دەخرایە سەر تارادەی شکاندنی ئێسکی جومجومە یان پێ.

(32) بردنە ژوورەوەی شیشی ئاسن و بۆری و سۆندە، لە کۆمی پیاودا و بەکارهێنانی هێلکەی کولێو و داخ بوو و بردنە ژوورەوەی لە کونی میزاوزێی ئافرەتدا.
(33) بەکارهێنانــی گۆچانــی کارەبایــی، یــان وایــەری کارەبایــی کە بە هۆیەوە شــوێنە ناســکەکانی لەش وەک پێلووی چاو و لووت و بن هەنگڵ و بەری پێ و دەوروپشتی دەست و پەنجە و ئەندامەکانی میزاوزێ بە کارەبای ڤۆڵتیە جیاوازەوە دەبەســترانەوە کەلەئەنجامی ئەمەشدا زۆر لە ئەشــکەنجەدراوەکان لــە هۆش خۆ دەچوون و تووشــی جۆرەها نەخۆشی مێشک و هی تر دەبوون.
(34) تێفرێدانــی زیندانیی لە چاڵی پیســایی بە قووڵایی 150 ســم: کە هەندێک جار چاڵی پیسایی مرۆڤ بووە و ئەشکەنجەدراو ناچار کراوە کە تامیبکات.
(35) بەکارهێنانی خوێ لە ئوتوو کردنی ئەو شوێنانەی کە لە ئەنجامی ئازارداندا بریندار بوون یا کێمیان هەڵێناوە: دیــارە کــە ئەمەش دەبێتە هۆی تەقیــن و لێک بوونەوەی پارچەکانی لەش.
(36) ئافرەت هەڵواســین: دوای بەســتنەوەی دەست و پێی ئەشکەنجەدراو بە قژیەوە هەڵواسراوە، ئەم ئازاردانە (وەک سزایەک) رەنگە هەر لە دۆزەخ هەبێت، بەڵام رژێم بەوەشەوە نەوەستاوە، بەڵکو لە کاتی (ماوەی بێ نوێژی) یاندا لنگە و قووچ بە رووتی و لە پێیانەوە هەڵواســراون

بۆ ئەوەی خوێنەکە لە شوێنی خۆیدا کۆببێتەوە و قەتیس بمێنێ یا ئەوەتا لە دەمییەوە فیچقە بکات.
(37) سـووتاندن بە هۆی سـۆپاوە: ئـەوەش لە ڕێگای دانیشـاندنی بێتاوانەکە ئەنجامدەدرا لەسـەر سـۆپایەکی گاز یـا کارەبایـی، دوای ئـەوەی کـە ڕووت دەکرایـەوە تـا پێسـتەکەی دەسـووتا یـا ئەوەتا دەسـت و پێیەکانی بـە کاویەیەکـی کارەبایـی دەبەسـترانەوە تا گۆشـت و ئێسـقانەکەی دەسـووتا یاخـود ئازاردراوەکـە لە چەند سـۆپایەکی کارەبایـی نزیک دەکرایەوە کە بـە دیوارەوە بەسـترابوونەوە پاش بەسـتنەوەی دەسـت و پێی پشتی لە سـۆپاکان نزیک کراوەتەوە تا ڕادەی سووتانی سک و پشت و ئەندامەکانی میزاوزێ.
(38) لە فەلاقەدان: ئەمە شێوازێکی کۆنی ئەشکەنجەدانە بەڵام وا دیارە لە سـەردەمی ڕژێمی دیکتاتۆری سـەدام حسـێن داهێنانـی نوێـی تێدا کـراوە، بەو هۆیـەوە دوو پیـاوی دڕندە، ئەشـکەنجەدراو لە نێـوان دوو پارچە دار دەبەسـتنەوە و پاشـان بەهێز پاڵەپەستۆی دەخەنە سەر و لـە دواییدا بەسەرپشـتدا فڕێی دەدەنە سـەر زەوی و پێیەکانی بەهەردوو دارەکەوە بۆ بڵندایی 80 – 100 سم بـەرز دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بە سـۆندە و کێبڵ و قامچی لە بەری پێیانی بدەن تا ئەسـتوور دەبێ و دەئاوسـێ و خوێنی تێ دەزێ، لەسـەر ئەوەش مەرگ نیشان دراوەکە

ناچـار دەکرێ لە ژوورەکەدا بەهـات و چوون ڕابکات یا ئەوەتـا هـەردوو پێیەکانی دەخرێتە نێو خـوێ ئاوکەوە، ئینجا ناچاری ڕاکردن دەکرێت.
(39) سـووتاندنی قژی سـەروریش، بە تایبەتی لەگەڵ پیاوانی ئاییندا.
(40) هەڵواسـین بە پانکەی هەواییەوە: ئەشکەنجەدراو لە دەسـتییەوە یان لە پێیەکانییەوە بە پانکەوە بۆ چەندین سەعات هەڵدەواسراو لەگەڵ ئەویشدا لە دەمو چاوو سکی دەدرا یا ئاگری لە ژێردا دەکرایەوە یا هەر بە هەڵواسینەوە کاویەی کارەبایی لێدەدرا.
(41) بەکارهێنانـی کونکـەری کارەبایـی (درێـب) بـۆ کونکردنی دەست یا پی یاخود پارچەی تری لەش هەروەها کونکردنی بەشێکی سەر بە هەمان دڕێل یان بە بزمار .
(42) ناچارکردنـی زیندانـی بە چاوی بەسـتراو و پێی خاوسەوە لەسەر تێلدڕ ڕابکات.
(43) ناچارکردنی زیندانی بە چاوی بەسـتراو و دەست و پێی بەسـتراوەوە کە لەسەر ڕوونی گەرم و داغ بەپێی خاوسەوە ڕابکات.
(44) شەقکردنی لێو و زمان.
(45) بردنە ژوورەوەی ئاو کە زۆر جاریش ئاوی گەرم بووە، لە 'سییەکانی' هەناسەدانی ئەشکەنجەدراو .
(46) ناچارکردنـی زیندانـی کە یەک سـەر و پۆتەلاکی

ئەوی تر بکوتێتەوە و ئازاری بدات.
(47) فڕێدانی زیندانی لە ژوورێکی پڕ لە مێش هەنگوین و زەنگەسووورە بە مەبەستی پێوەدانی، و ئازاردان و ژەهراویکردنی و دروستکردنی حاڵەتێکی نەفسیی دارماو.
(48) سووتاندنی تەواوی زیندانی : بە زیندوویەتی لە ژێر بڕ و بیانووی جیاجیادا.
(49) دانانی دەست، یا پەنجەکانی پێ لە درزی دەرگای ئاسنینەوە و پاشان بەهێز داخستنی و پەڕاندنیان.
(50) جێ هێشتنی لاشە لە ژووری زیندانییەکاندا: لە دوای لە سێدارەدانی کەسێک، تەرمەکەی فڕێ دەدرایەوە هەمان ژوور، ئەوەش وەک ئاشکرایە بۆ چاندنی ئیرهاب و ترس و لەرزە لە دڵی هاوەڵەکانیدا و لە هەمان کاتدا بۆ بڵاووبونەوەی نەخۆشی و دەردە، لە ئاکامی بۆگەن بوونی تەرمەکە.
(51) بەستنەوەی زیندانی لەسەر سک، بە چوار پایەکەوە و دەرهێنانی ئەندامەکانی میزاوزێ لە ژێرەوە و تێ بەردانی سەگ یا پشیلەیەکی مەشق پێکراو بە گاڵتەکردن لە گەڵیدا.
(52) بەکار هێنانی (خەڵ و بیبەر و زەرنیخ) لە سووتاندن و ئوتووکردنی ئەو برینانەی لەشی ئەشکەنجەدراو.
(53) بەستنەوەی دەست و پێی ئەشکەنجەدراو لە کاتی

خــواردن یا خواردنەوە، (ئەگــەر هەبێت) بۆ ئەوەی خۆی دابنێتەوە و حاڵەتێکی وەک سەگ وەربگرێ.
(54) رووتکردنــەوەی زانــا و پیــاوە ئاینییــەکان و ناچارکردنیان بە سەماکردن لەنێو هەموو زیندانییەکاندا.
(55) ناچارکردنــی زیندانی لە سیاســییە گەورەکان بە لاســاییکردنەوەی دەنگی مانگا و پشــیلە و سەگ و گوێ درێژ و گیانلەبەرانی تر..
(56) رووناکــی بــە هێــزی وەک پرۆژێکتــەر خســتنە ســەرچاوی ئەو زیندانییەی کــە ماوەیەکی زۆر رووناکی نەدیوە.
(57) دانانــی زیندانــی لە ژوورێک، یــا ژێرزەمینێکی وا کــە بە شــێوەیەکی هونەری دروســتکراوە و وەختێک پڕ دەکرێــت لە هەڵمی گەرم و لە پاشــدا پلەی گەرمییەکەی دەهێنرێتــە خــوارەوە تــا دەگاتە (پلەی بەســتن) و جل و بەرگــی ناوەوەی زیندانی بە لەشــییەوە رەق دەبێت، یان رژاندنی ئاوی گەرم بەســەر سەری زیندانیدا و لە پاشدا خســتنە بەر ســاردکەرەوە (مبردە) تا رادەی ســڕبوون یاخود تێفڕێدانی زیندانی لە حەوزی ئاوی تەزی .
(58) لێدان لە کەللەســەر: لە پێناوی ئەوەی زیندانییەکە شــێت ببێت و تووشــی نەخۆشــییەکانی دەمارەمێشــک ببێت.
(59) بۆ ئەشکەنجەدانی لەشی و دەروونی بێ سنووری

خانەوادەیەک، رژێم هەڵدەستا بە رووتکردنەوەی باوک و کچ و رووبەڕوو و لیک بەستنەوەیان، هەمان حاڵەتیشی لەگەڵ خوشک و براو (محرمات)ەکانی دیکەدا دەکرد.

(60) پاش بریندارکردنی ئەشکەنجەدراو و هەڵزڕاندنی شوێنێکی، پیاوانی ئەمن ئەشکەنجەییکی تریان دەکردە سەربار و خوێیان، برین و شوێنە دڕاوەکانیان بە بێ سڕکردن و خاوێنکردنەوە دەدووریییەوە و لە حاڵەتی هەوکردن و ئەستووربوون و پیسبوونی برینەکەشدا، هەمدیس بە هەمان شێوە و بە عەمدەن دەیاندووریییەوە.

(61) بەرزکردنەوەی پلەی گەرمای ژووری زیندان لە هاویندا بۆ سەروو (50) پلەی سەدی و پشت گوێ خستنی ئەشکەنجەدراو تێیدا تا رادەی لە هۆش خۆ چوون و مردن.

(62) بڵاوکردنەوە و بەرەڵلاکردنی سەگی هاری پۆلیسی و مار و دووپشک و مشک و قالۆچە و جرِ و جانەوەری تر لە ژوورەکانی زیندانییاندا.

(63) ئاو لە ژووری زیندانییەکان کردن، بە زستان ئاوی سارد و بەهاوین ئاوی گەرم.

(64) خەساندنی پیاوان: بەتایبەتی لاوان، ئەوانەی کە ژنیان نەهێناوە، ئەمەش لە رێگای پیشاندنی هەردوو جووتە گون بە ئامێری ئاسنین یان بە بەستنەوەی بە هۆی داوەوە.

(65) هێنانـــی مشـــک و قالۆچە و جانـــەوەری تر لەگەڵ خواردندا و ناچارکردنی زیندانی بە خواردنی.
(66) بەستنەوەی دەست و پێی زیندانی بە دوو ئۆتۆمبیلی رووکار (اتجـاە) جیـاواز بـۆ ئەوەی لەگـەڵ جولانەوەی ئۆتۆمبیلەکان زیندانییەکە ببێتە دوو کەرت.
(67) بەســـتنەوەی دەســـتەکانی زیندانی لە پشتییەوە و پاشان سەر لە ئاو نقوومکردنی و دووبارەکردنەوەی ئەم حاڵەتە بۆ ئەوەی هەناسەی تەنگ بێت.
(68) وەرگرتنـــی پارچەی ئەندامی لەشـــی مرۆڤ وەک چـــاو و خوێن و گورچیلـــە بۆ فرۆشـــتنەوەیان لە بازاڕە پزیشکییەکانی جیهاندا.
(69) کات و چۆنیەتـــی گرتـــن: بۆ ئیرهـــاب و تۆقاندنی خەڵک، رژێم لە کاتی نیوەشـــەوان بە ژمارەیەکی زۆرەوە هەڵی دەکوتایە سەر ماڵان و دەرگاکانی دەشکاند و پاش ســـوکایەتیکردن و گەڤکـــردن و زەبردان، بـــە ئۆتۆمبێلی بـــێ ژمارە گرتووەکانیـــان لە زینداندا تونـــد دەکرد یا بێ سەروشوێن دەکران و دەیانکوشتن.
(70) بەکارهێنانی لەشـــی زیندانی وەک تەپڵەکی جگەرە بـــۆ کوژاندنەوەی جگەرە لە ســـەریدا، بە تایبەتی شـــوێنە ناســـکەکانی، هەروەهـــا بەکارهێنانـــی لەشـــی ئافرەت بە رووتـــی چ بە زیندوویی یا بە مردوویی بۆ قومارکردن و خواردنەوەی مەشروب لە سەریدا.

(71) هەڵواسـینی زیندانـی بـە دەسـتی لـە پشـتەوە بەسـتراوەوە، بەبنمیچی ژووری زیندانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر بە هۆی زنجیری ئاسنینەوە، هەروەها هەمان حاڵەت دووبـارە کراوەتـەوە بـەڵام دەسـتەکانیان لە پێشـەوە بەستوونەتەوە کە ئازارەکەی تۆزێک سووکترە.

(72) تراشـینی سـەری زیندانـی بە تەواوی و پاشـان خراوەتە بەر لێشاوی دڵۆپە ئاوی تەزی و کوڵیو.

(73) ئەشـکەنجەدانی منـداڵان لەبـەر چـاوی دایک و باوکیان.

(74) رێگرتنـی زیندانی لە خەوتن پاش ئەوەی لەسـەر کورسـییەکی بڵندی وا دادەنرێت کـە پییەکانی نەگەنەوە زەوی، ئـەوەش بـۆ مـاوەی چەندیـن رۆژ دەخایێنـێ و ئەگەر خەوی لێبکەوێت ئەمنەکان بەدەم ئەشکەنجەدانەوە خەبەریان کردۆتەوە.

(75) رێگەنـەدان بە زیندانی کە بچێتە سـەر پێشـاو و لەسەر ئەوە یا دەبێت خۆی رابگرێ یان ... تا ئەو کاتەی ئەمنەکان میزاجیان هاتۆتە سەر.

(76) زانایـان و رۆشـنبیران و ئەدیبـان لەوانـەی کـە زیندانـی کراون بۆ سـووکایەتی پێکـردن، پیاوانی ئەمن هـەر کاتێکی ویسـتبێتیان ناچاریان کـردوون قۆندەرە و پێڵاوەکانیان ماچبکەن.

(77) تێخستنی ئەشکەنجەدراو لە لوولەیەکی ئاسنین و

ئـەم لوولەیەش خراوەتە نێو دەزگایەکی خول خولۆکەوە و بە خێراییەوە سوڕاوەتەوە.
(78) ئەشـــکەنجەدانی دەروونـــی مێرد یا برا یان باوکی ئافرەتێک بە رووتکردنەوەی و دەســـتدرێژی کردنە سەر نامووسی لەبەر چاویاندا.
(79) فڕێدانـــی ئەشـــکەنجەدراو بـــە چـــاوی بەســـتراو و دەســـت و پێی بەســـتراوەوە لە ژوورێکـدا کە چەندین (بڵندگۆ)ی دەنگی لێیە. بۆ شـــەڕی دەروونی زیندانییەکان وەک ئەوەی لە بلندگۆکانـــەوە پێیان بگوترێ: دەتانخەینە نێو قەفەســـی ئاژەڵە دڕندەکانەوە و لە دوای ئەوە دەنگی ئـــەو ئاژەڵانە بکەنەوە یان ئەوەیـــان بێننەوە بەرزەیێن کە پێیـــان لێدەنـــێ و دوای ئـــەوەی دەنگی شـــەمەندەفەر لە بڵندگۆکان بکەنەوە، بە شـــێوەیەک کە ببێتە هۆی ترس و تۆقاندن و سەرسووڕان و لە هۆش خۆچوون و پەردەی گوێ دڕان.
(80) فڕێدانـــی زیندانـــی لە ژووری 40×160 ســـم، بە شـــێوەیەک کە نەتوانێت دابنیشـــێ، بەڵکـــو دەبێت بە پێوە بخەوێت.
(81) بەســـتنەوەی هـــەردوو دەســـتەکانی زیندانـــی بە چەنـــد بوتڵێکی غازەوە و ناچارکردنی بە هەڵگرتنیان هەتا بەلادادێ.
(82) لەســـەر پشت خســـتنی زیندانی و هێنانی ئەمنێکی

قەڵەو و درێژ بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەک بچێتە سەر سنگییەوە و بینە قاقای بگرێت.
(83) بەکارهێنانی مەوادی کشتوکاڵی ژەهراوی لە سووتاندن و شێواندنی پارچە و ئەندامەکانی لەشدا، هەر بۆ ئەم مەبەستە ترشەڵۆکەکانی پیروکلیک یا پیرۆکسایدی یان ترشەڵۆکە خەستەکان بۆ تواندنەوەی ئێسکی دەست و پێ بەکاردێت.
(84) بۆیەکردنی نیوەی روو و دەم و چاو بەڕەنگێکی جێگر و چەسپاو کەنەڕوات یا تراشینی نیوەی سەری زیندانی یان نیوەی ریشەکەی و هێشتنەوەی بەوچەشنە بۆ سووکایەتی و گاڵتەجاڕی کە دیارە کارێکی دەروونی گەورە دەکاتە سەر زیندانی و جۆرەها نەخۆشی سایکۆلۆژی و لەشیی لێدەکەوێتەوە.
(85) بەستنەوەی ئەشکەنجەدراو بە کورسییەکەوە و دەرهێنانی (گون) لە کونێکی ژێرەوەی کورسییەکەدا و لێدان و ئەزیەتدانی، تا زیندانییەکە لە هۆش خۆی دەچێت و موزاعەفاتی خراپ بۆ ئەم ئەندامەی دروستدەبێت و هەندێ جاریش هەردوو لا گون خراونەتە نێو دەفرێکەوە کە مێش و مەگەز و جرۆجانەوەری تێدا بووە.
(86) تێکردنی هۆرمۆنی پیاوانە لە ئافرەتان کە دەبێتە هۆی موو لێهاتنێکی زۆر بە تایبەتی لە دەم و چاودا.
(87) بەستنەوەی لووتی زیندانی بۆ ماوەیەک بۆ

ئەوەی نەتوانێ هەناسەی لێوە بدات و ئەزیەت بە هەناسە وەرگرتنی دەمەوە بدات.
(88) پاش بەستنەوەی چاو و دەست و پێی زیندانی لەسەر پێ پلیکانەیەکی بڵند و بەرزەوە، بۆ خوارەوە گلۆر دەکرێتەوە، بەو مەبەستەی بریندار بێت و ئێسکەکانی لەشی بشکێن.
(89) ئەشکەنجەدانی زیندانی بە رووتکردنەوەی و وێنەگرتنی لەگەڵ چەند پیاوێکی ڕووت یا چەند ئافرەتێکی رووتی تردا و پاشان ئازادکردنی و ئیختیارکردنی لە نێوان کارکردن لەگەڵ دەزگای ئەمن و موخابەرات یا بلاو کردنەوەی ئەم وێنە ئابڕووبەرانە بە نێو خەڵک دا.
(90) پرژاندنی لەشی زیندانی بە کحولی (مەثیلی) یا کحولی (ئەثیلی) پاشان گڕدانی و کوژاندنەوەی بۆ چەندین جار، ئەمەش دەبێتە هۆی وەرەم و هەڵئاوسان و سووتان، ئەمنەکان بەوەشەوە نەوەستاون بەڵکو بۆ ئەشکەنجەدان زیاتر خوێ و خەل و بیبەریان بەو شوێنانەدا کردووە.
(91) حەپسکردنی ئەشکەنجەدراو لە کەلێن و بۆشایی تاریکی دیوارەوە لە رووبەری (50×50) سم بۆ ماوەی چەندین رۆژ بە بێ دەرگا کردنەوە لەگەڵ بەجێهێشتنی لانی کەمی خۆراکی ئەم چەند رۆژە.
(92) بەستنەوەی دەست و پێ و سەری زیندانی بە شێوەیەکی پێچەوانە، واتە بەستنەوەی دەستی چەپە بە

لاقی راستەوە، جارێک لە پێشەوە و جارێک لە دواوە، هەروەها بەستنەوەی دەستی راستە بەلاقی چەپەوە و بەستنەوەی هەردوو دەست یا هەردوو پێ بە ملەوە ... هتد.

(93) ئەشکەنجەدانی زیندانی نەخۆش: بۆ نموونە ئەگەر زیندانییەک نەخۆش بکەوتایە و سکچوونی بگرتایە، سەرەڕای چارەسەر نەکردنی رێی پێش ئاویشی لێدەگیرا.

(94) ئەو دکتۆر و پزیشکانەی بەندیخانە، لەوانەی ئەندامی حزبی بەعس بوون، لە جیاتی چارەسەر دەرمانی بە هەڵەیان دەدایە زیندانییەکان کە موزاعەفاتی دیکە پەیدا بکات.

(95) بەستنەوەی دوو پارچە ئەلەمنیۆم بەلەشی زیندانییەوە، یەکێکیان بە ناوچەی (نخاع الشوکی) و ئەوی دیکەیان بە لای خوارەوەی بڕبڕەی پشت و بەستنەوەی هەردوو پارچە بە هێزی کارەباوە.

(96) بەستنەوەی هەردوو لاگون و سەری زەکەر بە بارگەی کارەبایی و ئەشکەنجەدانی زیندانی بە کارەبا لێدانی ئەو ئەندامە ناسکانە.

(97) تێ ئاخنینی شلەمەنی گەرم و داخ لە دەمی زیندانیدا.

(98) تەوقات لێدان لە گوێی زیندانی بە شێوەیەک کە

پەردەکەی بدڕێنی و پاشدا لە سێدارەدانکردنی.
(99) کونکردنــی لووتــی زیندانییەکانی مەحکووم بە لە سـێدارەدان، تــێ خســتنی ئەڵقەیەک لەم کونە و پاشــان ڕاکێشــانیان لــە لایەن پیاوانی ئەمنــەوە و گێڕانیان بەناو زیندانییەکانی تردا بۆ تۆقاندن و چۆک پێدادانیان، پاشــان لــە ســێدارەدانکردنیان یــەک یەکە و بە تەنێنــی یا پێکەوە لەبەر چاوی زیندانییەکانی تردا.
(100) دانانــی لاپێچکێکی کورســی لەســـەر لاجانگ یا شــەویلاگی زیندانی و دانیشتنی یەک لە ئەمنەکان لەسەر کورسییەکە.
(101) تــێ ئاخنینــی زیندانییــەکان لــە نەخۆشــخانەی نەخۆشــییەکانی عەقڵــی و دەروونییەوە بــۆ ماوەیەک و مامەڵەکردنیان لەســـەر ئەو ئەساسە، لە کاتێکدا ئەو دەرد و بەلایانەیان لە سەرنەبووە.
(102) بەکارهێنانــی گۆچانــی کارەبایــی بــە درێژایی بڕبڕاگەی پشت و لێدانی کارەبای بەرەبەرە لە بڕبڕاگەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە.
(103) کاتێک کە بەناو (محقق)ەکان فشاریان خستۆتە سەر زیندانی بەوەی کە درۆ بکا و خۆی بکا بە جاسووس و پیــاوی بێگانــە، بــەوەی کە تــا ڕادەی مــردن لێدراوە و لــە حالێکــدا ئەگەر لە ژێــر باری ئەشــکەنجەدانەکەوە چووبێتــە ژێر باریــان، ئیعترافي بە جاسوســیەتی! خۆی

کردبێ کە نەیکردووە، ئەوا یەکسەر (تەشهیر) یان پێ کردووە و هێناویانەتە سەر تەلەفزیۆن و مەسەلەکەیان کردۆتە ئەمری واقیع و زیندانییەکە لە سێدارەیان داوە، یەک لەو هۆکارانەی کە بەکاریان هێناوە بۆ ئەوەی (بڵێ من جاسوسم) ئەوە بووە کە ژن و دایک و خوشکیان هێناوە و لەبەر چاوی ئەو رووتیان کردوونەتەوە، پاشان هەڕەشەیان لێکردووە یا بە ئیعتراف یا بە ئابڕوو بردنی ئافرەتەکان.

هەندێک لەو ماڵانەی کە ڕژێم بەشۆفڵ و تی ئێن تی و بۆمب، خاپوور و وێرانی کردوون،
هۆیەکەیشی دیارە

کەچی لەبەندی (22/ج)ی دەستووره کاتییەکەیدا دەڵێ: ماڵ حورمەتی خۆی هەیە، چوونە ناوی یان پشکنینی، تەنها بەپێی ئەو ڕێوشوێنانە دەبێت کە لە یاسا دیاریکراون...

تێگەیشتنی ((حورمەت)) لەڕوانگەی ڕژێمدا ئەوەیە کەدەیبینن!!

چەکی تەقلیدی وەک بۆمبەکانی ناپاڵم و فسفۆری و هێشوویی، یا تۆپ و هاوانی جۆراوجۆر، گشتیان قەدەغەن و ڕێککەوتننامەیەک و(3) پرۆتۆکۆلی نێودەوڵەتی دەربارەی ئەم چەکانە مۆرکراون؛ چونکە بەکارهێنانیان تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنن و بەهۆی پتر زەرەر لە خەڵکی مەدەنی دەدا و برینداری پێکراوەکانیش ئەوەندە زۆر دەبن، چارەسەریان زەحمەت دەبێت. کەچی ڕژێم (وەک لەو بەڵگە وێنەییانە دیارە) تەخسیری لەبەکارهێنانیاندا نەکردووە.

«.... تەئكیـدی فرمانـەكان دەكەینەوە بە تەقەكردن لـەوەی كەهەوڵی گەڕانەوە بۆ نێو خاكی عێراق دەدات، لەوانەی كە ڕاگوێزراون ـ تەواو......»

بروسكەی نهێنی
وەزارەتی ناوخۆی عێراق
ژمارە 2884 لە 1988/4/10

بەندی 18 لەجاڕی جیهانی مافی مرۆڤ دەڵێ: هەمووکەسێک مافی ئازادیی بیرکردنەوە و ویژدان. هەیە)). بەندی 19 لەهەمان جاڕنامەدا دەبێژێت: ((هەموو کەسێک مافی ئازادیی بیروڕا و ڕادەربڕینی هەیە ..)) لێرەدا لەسایەی حوکم و ڕژێمە شۆڤێنیست و پاوانخواز و تیرۆرستەکانی دژ بە بیری کوردایەتی (ئازادییەکان) ئاوا وەڵام دراونەتەوە(!!)

پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە بازرگانی و سیاسییەکان (1966) لەبەندی (1/12)یدا دەڵێ: (هەرکەسێک کە بە یاسایی لەنێو ئیقلیمی دەوڵەتێک دایە، مافی بە ئازادی هات و چۆ و هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێ بوونی هەیە) هەروا بەندی (3) لە جاڕی جیهانی مافی مرۆڤ دەڵێ: (هەمووکەسێک مافی ژیان و ئازادی و ئاسایشی خۆی هەیە) و بەندی (2/17) لە هەمان جاڕنامە دەڵێ: نابێت بەڕەمەکی موڵک لە هیچ کەسێک بسەنرێتەوە. ڕژێم پێشێلکردنی ئەو بڕوانامانەی بە تەرحیل و تەهجیر لە سنووری کوردستان و عێراقدا دەستپێکرد. لێرەوە :سەرەتاکانی جێبەجێکردنی پلان و نەخشەی ئیبادەکردن.

بەندی 1/26 لە جاڕی جیهانی مافی مرۆڤ دەقنووسی کردووە کە: ((هەموو کەس مافی فێربوونی هەیە....))
هەروا هەمان بەندی 2/26 دەڵێ: دەبێ ئامانجی پەروەردە، پێگەیاندنێکی تەواوی کەسایەتی مرۆڤ و پتەوکردنی ڕێزی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان و گەشەپێدانی بەیەک گەیشتن و چاوپۆشیکردن و دۆستایەتی لەنێوان هەموو گەلان و...)) ئەمەیان لە سایەی شۆڕشی مقاوەمەتی نیبادە ((شۆڕشی ئەیلول)) بەپێی ئیمکان و تا ڕادەیەکی لەبار فەراهەم بوو .بەڵام لەسایەی ڕژێمدا، چۆن مافێک و چ جۆرە پەروەردە و پێگەیاندنێک؟! لە چ بڕوایەکەوە؟!)).

تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، لەهەر کوێیەک ئەنجامدرابێ، جێگای لێکۆڵینەوەیە و ئەو کەسانەی کە بەڵگەی ئەوەیان لەسەر هەیە کە ئەو کەتتانەیان ئەنجامدابێت، جێگای بەدواداچوون و وەستاندن و (توقیف) و دادگایی کردنن. ئەگەر تاوانباران دەرچوون، سزا دەدرێن....(!!)

تیکەی دەقێکی نێودەوڵەتی

((نابێت هیچ کەسێک بخرێتە ژێر ئەشکەنجەدان یا سزایەک یاخود مامەڵەیەکی توند و تیژ یا نامرۆڤانە یان ناوڕووبەر ..)).
بەندی (7) لە پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە بازرگانی و پۆلیتیکییەکان (1966)

چۆن فەدەغەی هاتە زۆرمەی خۆل، یا کەم کردنەوەی دەکەیت بوبار سەکانت؟

کتێبی پەکەرلوی زانستەکات
لە دەولەتە عەرەبەکانی کەنداودا
١٤١٢ / ١٤١٣ ك
١٩٩٢ / ١٩٩٣ ز

جل وبەرگ
لە لۆکە دروست دەکەین.

## اللغة العربية وضرورة الحفاظ عليها

ان اللغة هي أحد مقومات الامة ، وان الامة ـ أية أمة ـ لا تعد أمة ما لم تكن لها لغة حية ، وبذلك فان قيمة اللغة مثل قيمة الارض والحدود ، فكما تحمي الامم أرضها ، وتحافظ على سلامة حدودها ، كذلك تحمي لغاتها ، وتنشد لها دائما السلامة والنقاء •

اللغة العربية اذن ، عنوان للامة ، وهوية لها ، ومن هنا ينشد ابناؤها المخلصون حمايتها ، والمحافظة عليها من تسرب الفساد اليها ، وشيوع الدخيل فيها •

جینۆسایدکردنی کەلتووری نەتەوەییەک لەمەیان منداڵدا. (بەردی بناغە). جارنامەی بنەماکانی ئالیکاری کەلتووری نێودەوڵەتی کەلە 1966/11/4 دا دەرچووە. لە بەندی (1/1) دا بەڕوونی دەڵێ: هەموو کەلتوورێک کەرامەت و بەهای خۆی هەیە و پێویستە ڕێزیان لێبگیرێت و بپارێزرێن. لە (2/1) یشدا، نەشێوا پێکردنی کەلتووری تایبەتی هەر گەلێک لە مافی و ئەرکی ئەوی دادەنێت ..

ئەو چەند نموونەیەلگەییە، پرۆگرامی قوتابخانەکانی و لای خۆی تایبەتی بە (مەشتەقەی حوکمی زاتی)! لە بەراورد کردنێکدا بۆت دەردەکەوێ لەدونیای ڕژێمدا چ باسە!!

## ثورية الوحدة العربية[١]

من كتاب « البعث والوحدة »
للقائد المؤسس الاستاذ ميشيل عفلق

## البعث والتراث

من كتاب « البعث والتراث »
للقائد المؤسس الاستاذ ميشيل عفلق

## اخلاقيــة البعثي

## المرأة في منظور حزب البعث العربي الاشتراكي

لـــكَ جَيْشٌ حُرٌّ مِقْـــدامْ
هُوَ جَيْشُ القـائـد صَـدّامْ

## الدرس الســادس

(القراءة العربية) للصف السادس الابتدائي ،

وهو أحد كتب المرحلة الابتدائية لحظة الحكم الفالي .

الدرس السابع عشر

من قصص قادسية صدام المجيدة

رسالة من جبهة القتال

پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافە ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان (1976) کە عێراق لایەنێکە تێیدا. لەبەندی (1/11)یدا پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشێ کە دەوڵەتانی هاوبەش دان بەوە دادەنێن کەهەموو کەسێک، خۆی و خێزانەکەی، مافی ئەوەی هەیە لە ئاستێکی ژیانی لە باردا بژێت، بەشێوەیەک کە پێداویستییەکانیان لە (خواردن) و جل و بەرگ و شوێنی حەوانەوە بۆ مەیسەر بکرێت...

چەکی کیمیایی (لەژێر ناوی تردا) ئەمەیان لە زۆر بڕوانامەی نێودەوڵەتیدا یاساغ کراوە. لەوانە (جاڕنامەی سان پترسبۆرگ1868)، ڕێککەوتننامەکانی لاهای (1899و 1907)، بەندی 23/ 1 لە هەردووکیاندا و پەیمانی ڤێرسای 1919 و پرۆتۆکۆڵی جنێف 1925.

بەدرێژایی ئەو وەختانە، ئەو جۆرە چەکانە تەنها لە دژی دوژمندا بەکار هاتوون، کەچی ڕژێمی بەغدا، وەک پێشینەیەک لەدژی خەڵکانێکدا وەکاری خست کە ڕەگەزنامەی وڵاتەکەیان هەڵگرتووە.....!

جاڕی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لەبەندی (2/25)یدا دەڵێ: دایک و منداڵ مافی یارمەتی و چاودێرییەکی تایبەتییان هەیە. لەهەمان پات کردنەوەیشدا. بنەمای دووهەم لەجاڕی مافەکانی منداڵ (1959)، پارێزگاریکردنی تایبەتیی منداڵ پێویست دەکات.
ڕژێمی بەغدا بەو ڕەنگەی کەدەیبینن ئیلتیزامی بەو بڕوانامە نێودەوڵەتییانەوە کردووە!!

بەندی (3/16) لە جاڕی جیهانی مافەکانی مرۆڤ، وای تێکست نووس کردووە کە: (خێزان یەکەیەکی سروشتی و بنەڕەتیی کۆمەڵگەیە و مافی ئەوەی هەیە کەلەلایەن کۆمەڵگە و دەوڵەتەوە بپارێزرێ ..) بەندی (11) یش لە دەستووری کاتی عێراق (دەستووری ڕژێم) دەڵێ: ((خێزان کرۆکی کۆمەڵە، دەوڵەت زامنی پشتگیری و پاراستنی دەکات...)).

جینۆسـاید، هەریەک لەو کارانـە دەگەیەنێ کـە بەمەبەسـتی وێرانکردنێکـی گشـتگیری یا بەشـگری گرووپێکی نەتەوەیـی یا ڕەگەزایەتی یاخود ئایینی ئەنجامدرابێت.

بەندی دووەم لە ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی تاوانی کۆمەڵکوژی و....

((1948/12/9))

لەگـەڵ هەموو ئەوانەیشـدا، کـورد هەر ماو هەر دەمێنێ. چونکە ڕەسەن و ڕەگاژۆ. شوێن پێی بە قووڵایی مێژووە. چونکە بەشـداری بەشـێکی زیندووی شارستانێتی ئینسـانییە.

# سەرچاوە و ژێدەر

**یەکەم : کتێب**

1 - المقدم بسام العسلي، الحرب والحضارة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الاولى، بيروت1979.
2 - دكتور حسنين ابراهيم صالح عبيد، الجريمة الدولية، دراسة تحليلية تطبيقية، الطبعة الاولى، القاهرة 1979.
-3 دكتور حميد السعدي، القانون الدولي الجنائي، الطبعة الاولى، بغداد 1971 .
4 - دكتور حامد سلطان، القانون الدولي العام في وقت السلم، دار النهضة العربية، الطبعة السادسة، القاهرة 1976.
5 - لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق، شهادات تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق. سورية 1990.
6 - لجنة الدفاع عن حقوق الانسان في العراق، السموم وسيلة من وسائل تصفية الخصوم السياسيين في العراق، سورية 1992.
7 - لجنة حقوق الانسان/ الدورة الثامنة والاربعون، تقرير عن حالة حقوق الانسان في العراق، اعده السيد ماكس فان ديرشتوئيل .
8 - الحملة العالمية لحقوق الانسان، حقوق الاقليات، صحيفة وقائع رقم 18،جنيف.
9 - الحملة العالمية لحقوق الانسان، القانون الانساني الدولي وحقوق الانسان، صحيفة وقائع رقم 13، جنيف.
10 - عبدالوهاب حومد، الاجرام الدولي،مطبوعات جامعة

الكويت، الطبعة الاولى 1978.
11 - عبدالوهـاب حومـد دراسـات معمقة في الفقـه الجنائي المقارن، مطبوعات جامعة الكويت،1983.
12 - الحملة العالمية لحقوق الانسـان، حقوق شـعوب السكان الاصليين، صحيفة وقائع رقم 9،جنيف.
13 - لجنة الدفاع عن حقوق الانسان، العراق والمجتمع الدولي، سورية 1991.
14 - دكتـور علي حسـين الخلف، الوسـيط في شـرح قانون العقوبات، النظرية العامة، مطبعة الزهراء، بغداد 1968.
15 - دكتور عباس الحسـني، شـرح قانـون العقوبات العراقي الجديد (القسم العام) مطبعة الأزهر، بغداد (-1969 1970).
16 - ضاري رشـيد السامرائي، الفصل والتمييز العنصري في ضوء القانون الدولي العام، دار الرشيد للنشر، بغداد 1983.
17 - اللجنة الدولية للصليب الاحمر، القواعد الاساسية لاتفاقيات جنيف و بروتوكوليها الاضافيين، الطبعة الثانية، جنيف1992.
18 - كنعان مكية، القسـوة والصمت، المؤتمر الوطني العراقي 1996 .
19 - د. وصفـي محمـد علـي، الطـب العدلـي علمـا وتطبيقا، بغداد1976.

دووهەم: گۆڤار و بلاوكراوەی ناوەناوە

20 - دراسات كردية، مجلة سنوية تصدر في خمس لغات عن المعهد الكردي / العدد 3-7 السنة الثامنة، باريس 1992.
21 - دراسـات كرديـة، مجلة دورية تصـدر في خمس لغات، الاكـراد، حقوق الانسـان والهويـة الثقافية، العدد -4 8، السـنة التاسعة، باريس 1993.

22 - حقوق الانســان، نشــرة دورية تصدرها لجنة الدفاع عن حقوق الانســان في العراق من العدد الاول (كانون الاول 1988) الى العدد الاربعون، (تموز 1994).

**سێهەم: ڕۆژنامەکان**

23 - بيار سانيه (الامين العام لمنظمة العفو الدولية)، فلنمض معا نحو انشاء المحكمة الجنائية الدولية، جريدة الحياة، العدد11906 في 1995/9/27.
24 - جورج طرابيشي (الابادة) من اليهود والغجر الى الشعوب السوفياتية فأهل كمبوديا- جريدة الحياة، العدد 11672 في 2/3/ 1995.
25 - ســناء الجــاك، هــل لســموم (قذائف الحــروب) دور في تناقص الخصوبة عند اللبنانيين (نقص معدلات الخصوبة)، جريدة الشرق الاوسط، العدد 6446 في 1996/7/22.
26 - فردريك معتوق، على من تقع مســؤليه الاباده الجماعية الارمنية، العام 1915، جريدة الحياة، العدد 12208 في 29/ 7/ 1996.
27 - جريدة (خەبات) لسان حال (ح.د.ك.ع)العدد785 في 19/ 1996/4.

**چوارەم: بڕوانامە یاساییەکان**

**بڕوانامە عێراقییەکان:**

28 - دەستووری کاتی عێراقی، کە بەپێی بڕیاری ژمارە 792ی مەجلیسی قیادەی سەورە لە 16/ 7/ 1970دا دەرچوو.
29 - یاســای ســزادان، ژمــارەی (111) ســاڵی 1969 ی دەسکاریکراو.

30 - یاسای چۆنیەتی دادگایی کردنی سزایی ژمارە (23) ساڵی 1971دەسکاریکراو .

31 - قرارات تفضح انتهاكات حقوق الانسان في العراق، لجنة الدفاع عن حقوق الانسان. سورية 1993.

**بڕوانامە نێودەوڵەتییەکان:**

32 - (جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ) کەبەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە 217 ئەلیف (د-3)، لە 10/ 1948/12پەسەند و بڵاو کراوەتەوە.

33 - (پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان) کە بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 2200 ئەلیف (د21-) لە کانونی یەکەمی 1966، پەسەندکراوە و بۆ واژووکردن و بڕواپێدان و چوونەڕیز، خراوەتەڕوو و لە 3ی کانوونی دووەمی 1976وە کار پێ کراوە.

34 - (پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافە باژێرڤانیی و پۆلیتیکییەکان) کەبەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 2200 ئەلیف لە 16ی کانونی یەکەمی 1966پەسەند کراوە و لە 23/ 1976/3وە کارپێکراوە.

35 - (ڕێککەوتننامەی لەنێوبردنی هەموو شێوەکانی جیاکاریی دژی ئافرەت) کەکۆمەڵەی گشتی پەسەندی کردووە و بەپێی بڕیاری خۆی 34/ 180لە 18 ی کانونی یەکەمی 1979 بۆ ئیمزاکردن و بڕواپێدان و چوونە ڕیزی دەوڵەتان، خستوویەتییە ڕوو لە3ی ئەیلولی 1981 ەوە کار پێ کراو .

36 - (ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی تاوانی جینۆساید و سزادان لەسەر ئەنجامدانی کە بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 260 ئەلیف (د3-) لە9ی کانونی یەکەمی 1948 پەسەندکراوە و بۆ واژووکردن و بڕواپێدان یا چوونەڕیز خراوەتەڕوو و

لـە12ی کانونـی دووەمـی 1951ەوە کارپێکـراوە و عێراق لە 1958/3/3بڕوایپێداوە.
37 - (ڕێککەوتننامەی بەسـەرنەچوونی تاوانەکانی جەنگ و تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی) کەبەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشـتی 2391(د3-) لە 26ی تشرینی دووەمی 1968دا پەسەند کراوە، لە 11ی تشرینی دووەمی 1970ەوە کارپێکراوە.
38 - (بنەماکانی ئالیکاری نێودەوڵەتی لە بەدواداچوون و گرتن و تەسـلیمکردنەوە و سزادانی کەسـانی تاوانبار بەئەنجامدانی تاوانەکانـی جەنـگ و تاوانەکانـی دژ بەمرۆڤایەتـی) کەبەپێـی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 3074 (د28-) لە 3ی کانونی یەکەمی 1973ەوە دەرچووە .
39 - (ڕێککەوتننامـەی قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە خەڵک و ئیستغلالکردنی داوێن پیسی غەیرە) کە کۆمەڵەی گشتی بەپێی بڕیاری 317ی (د4-) لە 2ی کانونی یەکەمی 1949، پەسەندی کردووە لە25ی تەممووزی 1951ەوە کارپێکراوە.
40 - (بنەمـا نموونەییەکانـی لانیکەمـی مامەڵەکـردن لەگەڵ زیندانـی و گرتـووەکان) کـە کۆنگرەی نەتـەوە یەکگرتووەکان بۆقەدەغەکردنـی تاوان و مامەڵەکردنی تاوانکاران کە لە سـاڵی 1955 دا لەجنێڤ گرێدرا، پەسەندیکردووە.
41 - جاڕنامـەی پاراسـتنی هەموو خەڵک لەتووشـبوون بە ئەشـکەنجەدان و لەجۆرەکانی تری مامەڵەکردن، یان سـزادانی توندوتیژانـە یـا مرۆڤانە یاخـود ئابڕووبـەر، کەبەپێی بڕیاری کۆمەڵـەی گشـتی 3452 (د30-) لەکانونـی یەکەمی 1975 دا پەسەندکراوە .
42 - (ڕێککەوتننامەی دژ بە ئەشـکەنجەدان و چەشـنەکانی تـری مامەڵەکردن یان سـزادانی توند و تیژ یاخـود دڕندانە یا

ئابووریی بەر) کە کۆمەڵەی گشتی بەپێی بڕیاری 39/ 46 لە10ی کانونی یەکەمی 1984دا، پەسەندیکردووە و لە 26ی حوزەیرانی 1987 دا کارپێکراوە.

43 - (جاڕنامەی مافەکانی منداڵ) بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککرتووەکان 1386(د14-) لە 20ی تشرینی دووەمی 1959دا دەرچووە.

44 - (جاڕنامەی پاراستنی ئافرەت و منداڵ لە حاڵەتەکانی نائاسایی و ناکۆکییە چەکدارەکاندا) بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی 3318 (د29-) لە14ی کانونی یەکەمی 1974دا دەرچووە.

45 - (جاڕنامەک سەبارەت بەپێشکەوتن و گەشەکردن لەبواری کۆمەڵایەتیدا) بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی2542(د-24) لە11ی کانونی یەکەمی 1969دا دەرچووە .

46 - (جاڕنامەی جیهانی تایبەت بە ڕیشەکێشکردنی برسێتی و بەدخۆراکی) کەکۆمەڵەی گشتی بەپێی بڕیاری 3348(د29-) لە17ی کانونی یەکەمی 1974دا پەسەندی کردووە.

47 - (جاڕنامەی بنەماکانی ئالیکاری کەلتووریی نێودەوڵەتی) کەکۆنگرەی گشتی ڕێکخراوی یۆنسکۆ لە خولی چواردەمینیدا، لە ڕۆژی 4ی تشرینی دووەمی 1966دا، دەریکردووە.

**پێنجەم : فەرهەنگ**

48 - الموسوعة العربية الميسرة، مجموعة من الخبراء، دار الشعب، الطبعة الثانية، القاهرة 1972.

## ناوەرۆک

## هەوڵەکانی نووسەر

ئەو کورتە توێژینەوانەی خوارەوەش، کە لە چوارچێوەی ((هەڵمەتی جیهانگیری مافەکانی مرۆڤ)) لە نووسنگەی UN- مەڵبەندی مافی مرۆڤ- جنێڤەوە دەرچوون ئامادەن بۆ چاپکردن:

* مافی کەمایەتییەکان (پێشتر لە رۆژنامەی برایەتی بە (7) حەوت ئەڵقە بڵاوکراوەتەوە.

* یاسا ئینسانیی نێودەوڵەتی و مافەکانی مرۆڤ (پێشتر لە رۆژنامەی هەرێمی کوردستان بە (9) نۆ ئەڵقە بڵاوکراوەتەوە).

* ئامرازەکانی نەهێشتنی ئازاروئەشکەنجەدان،لە(1997/8/15)ـەوە لە سەنتەری برایەتییە!).

* جارنامەی جیهانیی تایبەت بە ریشەکێشکردنی برسێتی و بەدخۆراکی.

* فیدراڵیەتی سویسرا، تایبەتمەندیی و سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی (حکومەتی جومعیە، دیموکراسی بە هەرێمی شێوەکانییەوە، بێ لایەنی و پرۆژەی هاوبەشیکردن لە پێناوی ئاشتی دا)و... هتد.